پەیامەکانی گەنجان
٢٦

زنجیرەی بابەتە فیکرییەکان ٣

# سروشت لە تەرازووی زێریدا



موحەممەد مەلا صاڵح شارەزووری

(٢٦) پەیامەکانی ڕێنوێن بۆ گەنجان

# سروشت

## لە تەرازووی ژیرییدا

نوسینی:

موحەممەد مەلا ساڵحی شارەزووری



## زنجیرە پەیامەكانی گۆڤاری ڕێنوێن ژمارە (٢٦)

- ناوی كتێب: سروشت لە تەرازووی ژیریدا
- نوسینی: موحەممەد صالح ئەبوبكر شارەزووری
- ناوی زنجیرە: زنجیرەی بابەتە فیكرییەكان
- ژمارەی زنجیرە: ٣
- تیراژ : ٢٠٠٠ دانە
- نۆبەی چاپ: یەكەم
- ساڵی چاپ: ٢٠١٥
- ژمارەی لاپەڕە : ٨٦ لاپەڕە
- دیزاینی بەرگ و ناوەڕۆك : ڕێنوێن
- پێداچونەوەی: كۆچەر محمد مەلا صالح
- چاپ : چاپخانەی ڕێ نوێ
- نرخ : تەنها (٢٥٠٠) دینار
- سەرپەرشتیكار : سەركۆ كریم احمد
- ئیمەیل: renwen٢٠٠٩@yahoo.com
- ماڵپەڕ: www.aubyc.com

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی كتێبخانە گشتییەكان ژمارەی (١٤١٩ )ی ساڵی ٢٠١٤ ی پێدراوە

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ وَيَا قَوْمِ مَا لِي أَدْعُوكُمْ إِلَى النَّجَاةِ وَتَدْعُونَنِي إِلَى النَّارِ * تَدْعُونَنِي لِأَكْفُرَ بِاللَّهِ وَأُشْرِكَ بِهِ مَا لَيْسَ لِي بِهِ عِلْمٌ وَأَنَا أَدْعُوكُمْ إِلَى الْعَزِيزِ الْغَفَّارِ * لَا جَرَمَ أَنَّمَا تَدْعُونَنِي إِلَيْهِ لَيْسَ لَهُ دَعْوَةٌ فِي الدُّنْيَا وَلَا فِي الْآخِرَةِ وَأَنَّ مَرَدَّنَا إِلَى اللَّهِ وَأَنَّ الْمُسْرِفِينَ هُمْ أَصْحَابُ النَّارِ* فَسَتَذْكُرُونَ مَا أَقُولُ لَكُمْ وَأُفَوِّضُ أَمْرِي إِلَى اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ ﴾

( سورة غافر / ٤١ . ٤٢ . ٤٣ )

**بیرکردنەوەیەك:**

ئـەو مرۆڤـەی ڕۆژێـك لـە ڕۆژانـی ژیـانی بـەو هـەموو تەمەنـە درێژەیەوە بردویەتیە سەر، بیرنەکاتەوە لە چۆنیەتی دروستبونی و لە کوێوە هاتووەتە جیهانی ژیان و بۆچی هاتووەو ؟ سوود لـە هاتنەکەی چییەو.. دەنگوباس چیەو..؟ دوای ژیان کە مرد بۆ کوێ ئەڕوات..؟ وە ئایا هەموو شتێك بە مردن کۆتایی دێت.. ؟ ئایا ژیان کۆچکردنێکی بێ ئامانجە لەدڵەوە بۆ گڵ و بەس!؟. یان ئەو شتانەی دەورو پشتی پێ خۆرو کەرەستەی ژیانی چۆن دروست بون؟.. ئایا هەر لە خۆیانەوە دروست بون یان هێزێك دروستی کردون..؟ ئەو هێزە چیەو کێیەو چۆنە..؟

ئەو مرۆڤە ڕۆژێك لە ژیانی تەرخان نەکات بۆ لێکۆڵینەوەی ئەم پرسیارانە، ئەوە مرۆڤ نیەو بەڵکو مافی ژیانیشی نیە.. ئەوەی کە هەموو پەژارەیەکی تەنیا بۆ پارەی چەورو مەمکی خڕو مێزی خواردنەوەو گوێی دینار بێت.. ئەوە ڕەوا نییە پێی بوترێت ئادەمیزادو.. ڕەوا نییە هیچ جۆرە نرخێکی لەناو کۆمەڵدا بۆ دابنرێت.. بەڵکو ئەوە تەنیا بەندەی ورگ و ئارەزوی خۆیەتی و بیروباوەڕی وەکو گەنگاوێکی لێ هاتوەو تەنیا میکرۆبی داوێنپیسی و چاوچنۆکی نەبێت هیچی تری لێ دەرناچێت.

کەواتــە پێویـستە لەسـەر هـەموو ئـادەمیزادێکی ژیـر (بـەپێی توانای خۆی) هەوڵ بدات بۆ ئەوەی بزانێت خـۆی چۆن دروست بوەو ئەم زەویەی لەسەری ئەژی چۆن دروست بوەو ئەم بونەوەرە فراوانە ڕەنگینە چۆن دروست بووە؟ وە بۆچی دروست بوو ؟

جا ئەگەر مرۆڤ هۆی دروست بونی بونەوەری بۆ دەرکەوت، ئەوکاتە دروستکەری زەوی . کە پارچەیەکی وردە لە بونــەوەر ـ و دروستکەری خۆی . کە گیاندارێکی سەرزەوییە . بە ئاسانی ئەدۆزێتەوە.





## بەشی یەکەم: هۆی دروستبونی بونەوەر :

### بونەوەر ( الكون )

مەبەستمان لە بونەوەر تەنیا زەوی یان کۆمەڵەی خۆر یان کەشکەشانی ڕێگای کاکێشان نیە... بەڵکو مەبەستمان لەو(کون)ە پان و پۆڕە فراوانەیە کە زاناکان دەڵێن ژمارەی هەتاوەکانی ئەستێرەکانی ئەم بونەوەرە لە هەرچی زیخ و چەوی سەر زەوی هەیە زیاترە.!! وە مەبەستمان لەو بونەوەرەیە وەکو (ئەنیشتاین - Einstein ) ئەڵێ[1] (ئەگەر باڵندنەیەکی ئەفسانەیی ببێت کە تیژی ئەو باڵندەیە لە هەر یەك چرکە (ثانیە)دا (١٨٦ هەزار) میل ببڕێت – واتە بە قەد تیشك تیژ بڕوات – ئەو باڵندەیە بفڕێت و بیەوێت بگاتە ئەوپەڕی بونەوەر ئەبێت (١,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) ساڵ ڕێگا ببڕێت... دیسان ئەم بونەوەرە وەستاو نیە، بەڵکو هەتا ئەم باڵندەیە ئەم ماوەیە ئەبڕێت بونەوەر ماوەی (١,٣٠٠,٠٠٠,٠٠٠) ساڵ ڕێگا فراوانتر ئەبێ و هەرگیز ناگاتە ئەوپەڕی بونەوەر[2] ئەگەر شەوێکی هاوین مانگە شەو نەبێ و سەیری ئاسمان بکەیت (٥٠٠٠)

---

[1] ئەمە تەنیا تیۆرێکی ماتماتیکیە ئەگینا لە ڕاستیدا تائێستا فراوانی بونەوەر بەتەواوی نەزانراوە .

[2] وَٱلسَّمَآءَ بَنَيْنَٰهَا بِأَيْيدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ – الزاريات – ٢٧ .





ئەستێرەیەك بەدی ئەكەیت، خۆ ئەگەر بە تەلسكۆبێكی ئاسایی سەیر بكەیت پتر لە (٢,٠٠٠,٠٠٠) ئەستێرەو هەتاو بەدی ئەكەیت... بەڵام ئەگەر بەو تەلسكۆبەی لە ڕوانگەی (ماۆنت بالۆمار لە ئەمریكا) دا هەیە سەیر بكەیت بلیۆنەها ئەستێرە و هەتاو بەدی ئەكەیت.[٣]

**ئایا بونەوەر هەر بووە..؟**

پێش ئەوەی پرسیارەكەمان {هۆی دروست بونی بونەوەر چی بووە.... ؟} دەست پێ بكەین. پێویستە بزانین كە ئایا بونەوەر هەر بووە (ازلي[٤]) یە، واتە سەرەتایەك بۆ دروست بونی نەبووە و هەر بووەو هەر بووە... یان ئەبێ سەرەتایەك بۆ دروستبونی بوو بێت و دروست بوو بێت یان كرا بێت... ؟

لێرەدا هەموو زانایان و فەیلەسوفەكانی هەموو ڕێبازە فەلسەفیەكان، هاتوونەتە سەر ئەوەی كە ئەبێ لەم بونەوەرەدا شتێك هەبێ سەرەتای نەبووبێ و (ازلي) بێ، جا ماددییەكان

---

[٣] الأسلام يتحدى – الأستاذ : وحيدة دين خان – ص٥٧ .

[٤] كاتێ كە ئێمە باسی ( ازل ) بۆ بونەوە ئەكەین نابێ بە ساڵ یان بە هەزاران ساڵ یان بە ملیۆن و ملیار ساڵ باسی بكەین چونكە ئەزەل واتە بێ سەرەتا ...جا بۆ ئەوەی كەمێك لە مانای ئەزەل بگەین ئەڵێم ئەگەر ژمارە ( ١ ) دابنێین و لەلای ڕاستی ژمارەكەوە بەقەد پانایی هەموو سەرزەوی خاڵ ( سفر ) دابنێین و ئەم ژمارەیە بكەین بە ساڵ هێشتا هیچ نرخی نییە لەبەرامبەر ووشەی ( ازل )دا .

ئـەڵێن مـاددە ئەزەلییـەو بونـەوەریش لـە مـاددە درووسـت بـووە کەواتـە بونـەوەریش ئەزەلییـە... ئـەم تیۆرەشـیان لەبـەر ئەوەیـە چـونکە هـەر کـە بڵـێن ماددەکـان یـان بونـەوەر ئـەزەلی نیـە.... یەکسەر یان ئەبێ هۆی دروستبونی بونەوەر یان دروسـتکەرێکی بـۆ دابـین بکـەین کـە ئەکەونـە گێژاوێکـەوە ماددییـەت هـەر لـە بناغەوە تێك ئەچێت و بنەبڕ ئەبێ [*]. ئێمەیش ئەڵێین نەبونەوەر و نە هیچ جۆرە ماددەیەك ئەزەلی نییە، بە گەواهی زانیاریەکەی سەدەی بیست، چونکە:

١. زاناکانی . جیۆلۆجی . چەسپاندویانە کە ئەو کاتەی زەوی لە کۆمەڵەی خۆر جیابویەوە،سوڕاندنەوەی بە دەوری(شەو و ڕۆژی) بە شەش کاتژمێر تەواو ئەکرد، دوایی وردە وردە خاوبویەوە بە ڕێژەیـەك کـە هـەموو (١٢٠ هـەزار) سـاڵ چـرکەیەك و هـەر (٤٣٢ ملیۆن) ساڵ کاتژمێرێك خولاندنەوەکەی دوا ئەکەوت هەتا وەکو ئێـستای لێهـات و بـوو بـە (٢٤) کاتـژمێر... وە ئێـستایش هـەر بەردەوامـە لـە خاوبونـەوە هـەتا تـەواو لـە جوڵـە ئەکـەوێت، بـۆ چەسـپاندنی ئـەم وتەیـە و وتـەی جیۆلۆجیـەکان، ڕۆژنامـەی

---

[*] وە موسڵمانەکان ناوەڵناوی (ازل) ئەدەن بە (خوا) جا نازانم ماددەی کەڕو بێ دەسەلآت شایەنی ئەم ناوەڵناوەیە یان خوایەکی بەو جۆرە کە موسڵمانەکان باسی دەکەن؟

(الاخبار)ی میسری لە ژمارەی ڕۆژی ١٩٧٢/١/٣ بڵاوی کردەوە کە زانایانی گەردونزانی لە (گرینجە)وە، هەواڵیان داوە بەوەی گۆی زەوی لە سوڕاندنەوەی ئاسایی خۆی دوو چرکە دوا کەوت و بۆ دەست پێکردنی ساڵی ٩٧٣ دوو چرکە چاوەڕوانی کرا [٦].

لەمەی سەرەوە بۆمان دەرئەکەوێ، ئەگەر بونەوەر ئەزەلی بوایە ئێستا هەموو پارچەکانی لە سوڕاندنەوە ئەکەوتن و ئەم زەویەی ئێمەیش – کە پارچەیەکی ئەم بونەوەرەیەو لەگەڵ هەموو پارچەکانی تری بە یەك یاسا ئەگەڕێن – لە خولاندنەوە ئەکەوت و ئەو لایەی بەرەو هەتاو ئەوەستا ڕۆژێکی سەرە مڕولاکەی تری شەوێکی سەرە مڕ ئەبوو... سوڕاندنەوەی زەوی و پارچەکانی تری ئەم بونەوەرە بەڵگەن لەسەر بونی سەرەتایەك بۆ هەموو ماددەکان و پارچەکانی تری بونەوەر [٧].

٢. هەموو زاناکان لەسەر ئەو ڕایەن کە (گەرمی) یەکێکە لە هۆ سەرەکیەکانی مانەوەی ئەم بونەوەرە، وە هەر ئەو زانایانە بۆیان دەرکەوتووە هەموو پارچەکانی بونەوەر بەرەو ساردبونەوە ئەڕوات و بەپێی یاسای دووهەمی دینامیکای گەرمی [٨]

---

[٦] ایماننا بالله بين فكر المطلق و القران العظيم ، الأستاذ محمود غريب ، ص٢ .

[٧] سەیری کتێبی گەشتەکەم لە گومانەوە بۆ باوەڕ ، لا ١٨٧ ( جزمی یەك ) بکە .

[٨] سەیری کتێبی گەشتەکەم لە گومانەوە بۆ باوەڕ ، لا ١٨٧ بکە.

(Second law of thermo dynamics) گەرمی لە تەنە گەرمەکانەوە ئەڕوات بۆ تەنە ساردەکان هەتا پارچەکانی لە پلەی گەرمیدا وەکو یەکیان لێ دێت،پاشان بەرەو ساردبونەوە – هەموویان – دەست پێ دەکەن . مانەوەی گەرمی لە بونەوەردا تا ئێستای ئێمە مانای بوونی سەرەتایەکە بۆ دروست بوونی بونەوەر، چونکە ئەگەر بونەوەر ئەزەلی بوایە ئێستا دەمێك بوو پلەی گەرمای ئەگەیشتە (٢٧٣-) لە ژێر سفری سەدیەوە، کە پێی ئەوترێت (سفری پەتی = الصفر المطلق) و زەویش نەئەما چونکە لەم پلەدا وزە ون ئەبێت.

٣. هەموو هەتاوەکان و ئەستێرەکان لە گۆڕانێکی سەرە مردان و ئەو وزەیەی بڵاوی دەکەنەوە وەکو تەقینەوەی بۆمبایەکی هایدرۆجینی وایە لە بارستاییەکەیان کەم ئەبێتەوە چونکە بارستایی- وزە \ چوارگەی خێرایی تیشك

خۆ ئەگەر ئەزەلی بوایە ئێستا بارستایی هەتاوەکان و ئەستێرە وزە دارەکان نەئەماو هەموویان ئەبون بە وزەو بڵاو ئەبونەوە... مانەوەی بارستایی هەتاوەکان و ئەستێرە وزە دارەکان (نجوم) مانای بونی سەرەتایەکە بۆ بونەوەر.

٤. زۆربەی . ئەگەر نەڵێین هەموو زاناکان باوەڕیان بە سەرەتایەك بۆ دروستبونی بونەوەر هەیەو باوەڕیان بەوە هەیە کە نە





بونەوەرو نە هیچ ماددەیەك ئەزەلی نییە، تەنانەت هەندێك لە زاناكان تەمەنی بونەوەر دائەنێن بە (٥,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) ساڵ و تەمەنی زەویش دائەنێن بە نزیكەی (دوو هەزار ملیۆن ساڵێك)، وە زانایان بۆ دۆزینەوەی تەمەنی بونەوەر چەند ڕێگایەكی زانیاریان هەیە بە تایبەتی بۆ ئەم مەبەستە كەڵكێكی گرنگ لە چەندێتی و مانەوەی نێوان گۆڕانی ماددەی یۆرانیۆم بۆ قورقوشم وەرئەگرن، چونكە ڕێژەی گۆڕاندنی یۆرانیۆم بۆ قورقوشم و كات و ماوەی گۆڕینەكە زیاد و كەم ناكات، لەهەر پلەیەكی بەرز یان نزمی گەرمادا هەبێ و هەرجۆرە گۆڕانێكی بەسەردا بڕوات[٩].

٥. ئێمە لە ڕۆژانی ژیانمانداو بە گەواهی زاناكان ئەبینین چۆن كەهەر ماددە كەم ئەكات و ئەچێتە سەر وزە.. تا ئێستایش لە سەرچاوەیەكی ڕاستەوە نەبیستراوە كە وزە ببێتەوە بە ماددە.. تەنانەت ئەم هەموو دەسەڵات و هێزەی سەدەی بیست نەیتوانیوە تاقە ئاتۆمێكی ماددە كە بووبێت بە وزە بیگەڕێنێتەوە بۆ ماددە.. ئەمەیش ئەوە ئەگەیەنێت ڕۆژێك دێت هەموو ماددەكان ببن بە وزەو ماددە نەمێنێ و هیچ دیمەنێكی

---

[٩] الاسلام يتحدى ص٧٦ .





بونــەوەرو ژیــان نــەمێنێ، خــۆ دیــارە هەرچــی کۆتــایی هــات.. سەرەتایشی بووە[10].

٦. وزە بریتیە لە توانای (جوڵە - حرکە)... هەموو بونـەوەریش لـە ئـاتۆم پێکهـاتووە، وە ئـاتۆمیش لـە ئـەلیکترۆن و پرۆتـۆن و نیــوترۆن پێکهــاتووە، ئــەلیکترۆن بــە دەوری نــاوك (نــواة) ئەسوڕێتەوە بە تیژیەکی سەرسوڕهێنەر بەهۆی ئەم سوڕاندنەوە ئـەم دیمەنـە جوانـەی بونـەوەر بـەدی ئەکـەین... خـۆ ئەگـەر ئـەم سـوڕاندنەوە نەبوایـە (نـاوك) ئەلیکترۆنـەکانی ڕا ئەکێـشا بـۆلای خــۆی و قــەوارەی بونــەوەر بەشــێوەیەك ئەچــووەیەك و بــچوك ئەبویـەوە بە ئەندێشەی کەسدا نایـەت، زاناکان ئـەڵێن قـەوارەی گۆی زەوی بەقەد هێلکەیەکی لێ ئەهات[11].

---

[10] هەرچەندە لەم شەوانەی دواییدا و لە بەرنامەی ( العلم للجمیع ) لە تەلەفزیۆنی کەرکوکـەوە گوێمـان لـە مامۆسـتا ( کامـل دبـاغ ) بـوو لەگـەڵ دکتۆرێـك ئـەدوا دکتۆرەکە وای پیشان ئەدا کە وزە ئەگەڕێتەوە بۆ ماددە ، بەڵام شیتەڵکردنەوەی دکتۆرەکە لە چوارچێوەی ( تیۆر ) دەرنەئەچوو .

[11] الله سبحانه و تعالى ، الأستاذ صلاح الدین مجید ، ص١٠ .

وەکو له پێشەوە وتمان وزە بریتیە له توانای جوڵە خۆ دیاریە کە وزە لەناو ئەچێ[12] . خاڵی دوهەمی ئەم باسەمان دووبارە بخوێنەرەوە – کەواتە ماددەیش لەناو ئەچێت چونکە ( وزە = بارستایی × چوارگەی خێرایی تیشك)، کەواتە ماددە کەم ئەکات و هەرچیش کەمی کرد سەرەتایەکی هەیەو ڕۆژێك بووە کە نەبووبێت... بەم خاڵانەی پێشوو بەو جۆرە زانیاری بۆی سەلماندین کە بونەوەر سەرەتایەکی بووەو ڕۆژێك بووە کە نە بونەوەرو نە هیچ ماددەیەك نەبووە...جا ئێستا با بزانین ئەم بونەوەرە چۆن دروست بووە و و هۆی دروست بونەکەی چی بووە..؟ چ هێزێك توانیویێتی ئەم بونەوەرە لە نەبونەوە بگوێزێتەوە بۆ جیهانی بون (الوجود)..؟ وە ئایا ئەو هێزە خوایە یان سروشتە یان ڕێکەوتە، یان شتێکی ترە؟!.

**هۆی دروست بونی بونەوەر چی بووە ؟**

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە فەیلەسوف و زاناکانی جیهان هەر لە دێرین ڕۆژگارەوە هەتا ئەمڕۆ چەند تیۆرێکیان لەم بارەوە بووە... بەڵام ئەگەر هەموو وتەکانیان بدەین لە بێژنگی ژیری لەم چوار کۆمەڵە و تیۆرانە دەرناچن:

[12] سەیری کتێبی زیندەوەرزانی پۆلی چوارەمی ئامادەیی گشتی چاپی سێهەم ، ساڵی ١٩٥٧ ، ل١٢ بکە .

١ـ کۆمەڵەی یەکەم ئەڵێن: ئەم بونەوەرە (بێ یاسایە) واتە هەرەمەکیەو هیچ یاسایەکی تایبەتی نییە بۆ جیهان و بونەوەری بێ یاساش پێویستی نە بەخواو نە بەهێزێکی هەڵسوڕێنەر نییە.

٢. کۆمەڵەی دووەم ئەڵێن: ئەم بونەوەرەو ئەم دیمەنە ناوازەیە بە (ڕێکەوت) دروست بووە.

٣ـ کۆمەڵەی سێیەم ئەڵێن: (سروشت = طبیعة) ئەم بونەوەرەی دروست کردووە.

٤. کۆمەڵەی چوارەم ئەڵێن: (خوا)یەکی بە دەسەڵات و توانا دروستی کردووە.

**تیۆر(کۆمەڵە)ی یەکەم ـ (بونەوەر بێ یاسایە)**

هەندێ لە فەیلەسوفەکان لە کۆن و نوێدا لایان وابووە ئەم دیمەنەی بونەوەر هیچ یاسایەکی تێدا نیەو بریتیە لە ئاشوبەو هەڕەمەکی، یەکێ لەو فەیلەسوفانەی کە خاوەنی ئەم تیۆرەن (سارتەر - Sartre )ە.

بەڵام باسەیرێکی ئەم بونەوەرە گەورەیە بکەین هەر لە بچوکترین پارچەی ئەم بونەوەرە کە (ئاتۆم)ە هەتا گەورەترین پارچەی کە (کەشکەشان - مجرە)ە و بزانین کامەیە هەڕەمەکی ئەم بونەوەرە ؟..

لە ئاتۆمدا هیچ ئەلکترۆنێك ناگوێزرێتەوە بۆ خولگەیەکی تر هەتا (بارگە - شحنە) یەکی نەدرێتێ کە بەرامبەر بێ بە هێزی جوڵەکەی بە دەوری ناوکدا.

لە کەشکەشانەکاندا بە هەزاران هەتاو و ئەستێرە لەناو ئەچێ و هەزاران هەتاو و ئەستێرەی تر پەیدا ئەبن، بەڵام هەمویان بەپێی ئەندازەیەکی زۆر ورد و یاسایەکی نەگۆڕاو [١٣].

خۆ ئەگەر سەیری هەر پارچەیەك لە پارچەکانی ئاسمان بکەین ئەبینین هەریەکەیان خولگەیەکی تایبەتی خۆی هەیەو هەتا هەتایە ناکەوێت لە هیچ ئەستێرەییەکی تر... زاناکان ئەڵێن کۆمەڵەی خۆر بە خۆیی و کۆمەڵەکەیەوە بە دەوری کەشکەشانی (ڕێگای کاکێشان - درب التبَان) دا ئەسوڕێنەوە، دیسان ئەم کەشکەشانە گەورەیە بەو هەموو ئەستێرەو هەتاوانەی هەیەتی بە دەوری خۆیدا ئەسوڕێتەوە کە ئەوەندە فراوانە بە (٢٠٠ ملیۆن) ساڵی تیشکی ئەمجا دەورەیەك تەواو ئەکات ... لە کاتی ئەم سوڕاندنەوەیەدا لەگەڵ کەشکەشانێکی تر – لە خۆی

---

[١٣] سەیری الروح و الجسد ، للکتاب الاسلامي العلمي د.مصطفی محمد ص ٧٤ بکە .

گەورەتر یان بچوکتر – دا تێکەڵ ئەبێ، بێ ئەوەی هیچ ئەستێرەیەکی هیچکامێکیان لەوی تریان بکەوێت [١٤] !!

خۆ ئەگەر سەیرێکی زانیاری لاشەی خۆمان بکەین بۆمان دەردەکەوێت کە چۆن هەموو پارچەیەك بەڵکو هەموو (خانە)سێڵێك ئەرکی سەرشانی خۆی بە یاسایەکی زۆر ورد بەجێ ئەهێنێ، بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر [١٥].

ئەم یاسا جوانەی لە بونەوەردا بەدی ئەکرێت، هیچ ژیریەك نیە کڕنوشی بۆ نەبات و ددانی پێدا نەنێت... مەگەر مرۆڤێك نەخۆش (نەخۆشی بیروباوەڕ) بێت.

تەنانەت ئەو ماددە ڕەق و تەقەی هیچ جۆرە هەستێکی نیە، مل کەچە بۆ ئەو یاسا ناوازەیە.

ئاو... کاتێ هاتە کوڵ ئەتوانین بڵێین پلەی کوڵاندنی ١٠٠ سانتی گرادە) بێ ئەوەی سەیری گەرمی پێو (تەرمۆمەتر) بکەین، چونکە پاڵەپەستۆی هەوا (٧٦٠) ملم جیوەیە خۆ ئەگەر پاڵەپەستۆی هەوا کە کەمتر بوو ئەو کاتە پێویستی بە وزەی کەمتر هەیە بۆ پاڵ پێوەنانی گەردەکانی ئاوەکە و گۆڕانی بۆ

---

[١٤] الاسلام يتحدى ص ٥٨ .

[١٥] گەشتەکەم لە گومانەوە بۆ باوەڕ ل٥٣ بخوێنەوە .

دۆخی هەڵم... ئا بەم شێوەیە ئاو کە ماددەیەکی بێ هەست و بێ گیانە گەردن کەچە بۆ یاسایەکی تایبەتی لەم بونەوەرەدا.

ئەگەر زاناکان بە وردی سەیری بونەوەر بکەن و چاودێری بکەن... بەهۆی ئەو یاسا ناوازەیەی لەم بونەوەرەدا هەیە ئەتوانن زۆر شت پێش ڕوودانەکەی، چۆنێتی ڕووداوەکەو شوێنی و ڕۆژو کاتژمێری ڕووداوەکە دەستنیشان بکەن.

بەهۆی تیۆری گەردونی (نیوتن)ەوە زانایان – ئادمز- وە – لاڤرییر – توانیان مژدە بدەن بە بەدی کردنی ئەستێرەیەکی تازە لە کۆمەڵەی خۆردا... کەچی هەروایش بوو لە ڕوانگەی بەرلین لە شەوێکی ساڵی ١٨٤٦ دا بە پێی دەستنیشانکراوی ئەوان ئەو ئەستێرەیە ئێستا پێی ئەڵێن (نیپتۆن) و لە کۆمەڵەی خۆردا دۆزرایەوە.

(وە زانایان ئەڵێن ڕۆژی ١٩٩٩/٨/١١ – واتە پاش ٢٢ ساڵی تر خۆر ئەگیرێ)[١٦] ئەمە هەواڵێکی درۆ نوقلانەیەکی بێ بەڵگە نیە... بەڵکو ئەو یاسا وردە سەرسوڕهێنەرەی لەم بونەوەرەدا هەیە ئەم شتانە بە ماوەیەکی زۆر پێش ڕودانەکە بە زاناکانی ڕائەگەیەنێ... ئەم بونەوەرە شانۆی یاسا و ڕژێمێکی زۆر وردە... هەموو شتێك سنورێکی تایبەتی خۆی بۆ دانراوە و

---

[١٦] الاسلام يتحدى ص٦٩ .

هەرچی لەو سنورەی خۆی دەرچوو مانای لە یاسا دەرچوونە و شایەنی سزایە... بۆ نمونە:

لەم سالأنەی دواییدا لە . ئوستراليا . دا جوتیارەکان جۆرە گیایەکی دڕکاوی – چەشنێك لە زریسك کە پێی ئەڵێن . Cactos. یان چاند بۆ پەرژینی کێڵگە و باخەکانیان [17]... بەلأم ئەم زریسکە لەبەر ئەوەی دڕکەکەی زۆر تیژو چڕ بوو هیچ گیانەوەرێك و کرمێك نەیئەخوارد.... ئەمیش بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر پەرەی ئەسەند، ئەم دڕکە لە باتی ئەوەی پەرژینی باخ بێ و چێنراوەکان بپارێزێ لە زیان، کەچی خۆی هەموو کێڵگەکەی داپۆشی و هەموو کشتوکاڵی جوتیارەکانی لەناوبرد و مەترسی – ئوستراليا – ی داگیرکرد، بە کشتوکاڵیشەوە نەوەستا بەڵکو هێرشی هێنایە سەر ئاوایی و شارەکان، خۆ چاندنی دانەوێڵە شتێکی ستەم نەبوو... بەهیچ جۆرە دەرمانێکی کیمیاوی و کۆششی پسپۆڕانی شارەزای کشتوکاڵ چارەسەر نە ئەکرا... هەتا زانایانی گیانداران توانیان کرمێك بدۆزنەوە کە ئەو کرمە تەنیا بەو زریسکە ئەژیاو هیچی تری نە ئەخوارد ئەو دڕکە نەبێ... ئەو کرمەیش زۆر زوو پەرەی ئەسەند زۆر ئەبوو هیچ زیندەوەرێکی ئوسترالی دژی نەبوو...

---

[17] العلم يدعو للايمان – ا ، كريسۆن ص١٥٩ ، ط٥ .

هەتا بە ماوەیەکی کەم کرمەکە زاڵ بوو بەسەر ئەو درکە نالەبارەداو وڵاتەکە ڕزگاری بوو، ئەوەیە بۆ دانانی ڕێژەیەکی نەگۆڕاو لەم بونەوەرەدا.

کەواتە ئەوانەی ئەڵێن ئەم بونەوەرە بێ یاسایە و جیهانی بێ یاساش خوای نیە ئەوانە هەموو ڕاستیەکیان پێشێل کردووە زانیاری و ژیری ئەیانخەن بەدرۆوەو تیۆرەکەیان بێ بەڵگە ئەمێنێتەوە.

**تیۆری دووهەم: بونەوەر بە ڕێکەوت دروستبووە**

تیۆری دووهەم لە پوچیدا هیچی کەمتر نیە لە تیۆری یەکەم چونکە ئەمانیش ئەڵێن... ئەم بونەوەرە یاسای تێدایە بەڵام ئەم یاسا و دیمەنە شیرینەی بونەوەر بەڕێکەوت دروست بووە.

هەرچەندە ئەم تیۆرەمان وا تێکشکاند کە ڕێکەوت پەرستەکان کەمێك شەرمیان بێتەوە، ئیتر ڕەوا نیە هیچ نرخێك بۆ (ڕێکەوت) دابنێن، چونکە ئەوەی کتێبی – ڕێکەوت لە تەرازووی ژیریدا[18] ی بە وردی خوێندبێتەوەو مەبەستی دۆزینەوەی ڕاستی بێ، تازە لەو بڕوایەدا نیم بە هیچ جۆرێك هێمای ئەو تیۆرە هەڵەیە لە مێشکیدا مابێت... بەڵام لێرەشدا تاقی کردنەوەیەکی زانیاریتان

[18] لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کوردە و ساڵی ١٩٧٦ بڵاوی کردەوە.

ئەخەمە پێش چاو بۆ ئەوەی بزانین نرخی ڕێکەوت چەندە لە دروست کردنی بونەوەردا.. ؟

زانایەکی سویسری بە نێوی (چارلز یوگین گای)[19] هەڵسا بە تاقیکردنەوەیەکی ماتماتیکی بۆ دۆزینەوەی ڕێژەی ڕێکەوت لەم بونەوەرەدا.

زۆربەمان ئەزانین کە (پرۆتین) لەو ماددە تێکەڵییە بناغەییانەیە هەموو خانەیەکی لێ پێك دێ... وە پرۆتین خۆیشی لە کاربۆن و هایدرۆجین و نایترۆجین و ئۆکسجین و گۆگرد و... هتد... پێك هاتووە... وە ژمارەی ئاتۆمەکانی بریتی یە لە (٤٠,٠٠٠) ئاتۆم لەتاقە گەرد (Á)ێکی پرۆتینیدا. خۆ دیاریشە کە توخمەکانی کیمیاوی لە بونەوەردا بریتین لە (١٠٢) توخم... جا ئەگەر بە شێوەیەکی هەڕەمەکی پرژو بڵاوببێتەوە و بمانەوێ بزانین چۆن بە شێوەی ڕێکەوت ئەم توخمانە کۆ ئەبێتەوە و تاقە یەك گەرد (مولیکۆل)ی پرۆتینی بە ڕێکەوت دروست ئەبێ.

زانای ناوبراو هەڵسا بە تاقیکردنەوەیەکی ماتماتیکی فراوان بۆ دۆزینەوەی ئەنجامی ئەم مەبەستە... سەیری کرد تەنیا بۆ

---

[19] ÇáØÈíÚÉ ÚáãÇÁ و الايمان بالله ، فرحان البغدادي ص١٦ .

دروستبونی ئەم گەردە پێویستمان بە ملیۆن جار ئەوەندەی ئەم بونەوەرە ماددەی تر هەیە بۆ دروستبونی ئەم تاقە گەردە [٢٠]...

ئەمە لە بارەی ماددەو کەرەستەوە..... خۆ لە بارەی کاتیشەوە:

بۆ گونجانی یەکگرتنی ئەم ماددانە لەگەڵ یەکترو دروستبونی یەك تاقە – گەردە – پێویستمان بە ڕێژەی (١) بەرامبەر بە (١٠ توان ١٦٠) ساڵ هەیە، واتە ژمارەی (١٠) (١٦٠) جار بدرێتەوە لە خۆی، ئەوەندە ساڵمان ئەوێ بۆ دروستبونی – تاقە گەردێکی پرۆتینی – کە ئەم ژمارەیە لە هەموو تەمەنی بونەوەر زیاترە.

لەگەڵ ئەوەشدا کە پرۆتین ماددەیەکی کیمیاوییە وەکو ماددەکانی تر و ژیانیشی تێدا نابێ هەتا نەبێتە پارچەیەك لە خانە (سێلّ)

ئەگەر بۆ دروستبونی گەردێکی بێ نرخ بەڕێکەوت بەو جۆرە بێ ! ئەی ئەبێ بۆ دروستبونی هەموو بونەوەر – هەر بەڕێکەوت – چەند کات و چەند کەرەستەمان بوێت.. ؟؟!!

**تیۆری سێهەم :**

---

[٢٠] سەیری تەفسیری (في ظلال القرآن) و ئایەتی ( انا كل شئ خلقناه بقدر / سورة القمر ) بکە

## سروشت (طبیعة) ئەم بونەوەرەی دروست کردووە

خوێنەری بەڕێز بەو شێوە زانیاریە بۆمان دەرکەوت کە ئەم بونـەوەرە سـەرەتایەکی بـووەو دیـسان بۆمـان دەرکـەوت ئـەم بونەوەرە بە یاسایەکی زۆر وردو قەشەنگ کار دەکات، هەر لە بچوکترین ئاتۆم هەتا گەورەترین کەشکەشانی گەردون.

وە ژیـری و زانیـاری هـەرگیز ڕێـی ئـەوەمان نـادەن بڵێین ئـەم یاسا ناوازەی بونەوەر بە ڕێکەوت دروست بووە. جا ئێستا با بـزانین ئـەم بونـەوەرە بـەم یاسـا جوانـەوە چـۆن پێکهـاتووە و دروست بووە.. ؟ یان سروشـت دروسـتی کـردووە وەکو هەندێك ئـەڵێن، یـان هێزێکـی بەدەسـەڵات تـر لـە سروشـت دروسـتی کردووە.

لێرەدا ئـەڵێم بەداخـەوە کـە زۆربـەی لاوەکانمـان وەکـو تـوتی فێری چەند وشـەیەك بـون ئەیڵێنـەوەو لـەو بڕوایـەدا نیم کە ئەو لاوانـە لـە مانـای ڕاستەقینەی ئەو وشـانە تێبگـەن... یـەکێك لـەو وشـانە، ئەوەیـە کـە ئـەڵێن (سروشـت ئـەم بونـەوەرەی دروسـت کردووە) یان ئەڵێن (سروشت ئەوەی بە فلأنە شت بەخشیوە). با ئێستا بـزانین سروشـت چییە ؟.. ئایا ئـەتوانێت شـت دروسـت بکات یان شت ببەخشێت ؟..

ئەگەر بە تەرازویەکی زانستیانە وشەی (سروشت) بکێشین سەیر ئەکەین لەم سێ واتایەی خوارەوە دەرناچێت:

- سروشت یان بریتیە لەو کۆمەڵە ماددەو ئاتۆم و توخمانەی کە ئەم بونەوەرە فراوانەیان لێ پێك هاتوون.

- یان بریتیە لە هێزێکی بە دەسەڵاتر لە ماددە، بەڵام هەڕەمەکی کارەکانی ئەکات، واتە یاسایەکی تایبەتی نییە چونکە سروشت هێزێکی – شەلم کوێرم ناپارێزمە – و کوێرانە پەل ئەهاوێ.

- یان سروشت بریتیە لە هێزێکی بە دەسەڵات تر لە ماددەو زاناو تواناو ئاگادارە لە هەموو هەڵسوکەوتێکی پارچەکانی بونەوەر.

وە ئێستایش با بزانین بە کام واتایان – سروشت – ئەتوانێت شت دروست بکات و ئەبێتە دروستکەری بونەوەر:

١. با بێینە سەر واتای یەکەم و گریمان هەر ئەم ماددانەی بونەوەر خۆیان دروستکەرو هۆی دروست بونی ئەوی تریانن (بەو واتایەی کە – سروشت – ماددە بێت).

ئەگەر نمونەی هەرچی ماددە هەیە لەم بونەوەردا وەربگرین و لە تەرازووی ژیریدا بیانکێشین سەیر ئەکەین بەرزترین ماددەو سەرکەوتوو ترین ماددەو ئاڵۆزترین ماددە بریتیە لە مۆخی مرۆڤ

[21]... مـۆخـی ئـادەمیزاد بـەرزترین و نـەرمترین ماددەیـە لـەم بونەوەردا.

خـۆ بـەم خاڵانـەی خـوارەوەدا کـەم دەسـتی و هەسـتی ئـەم مۆخـەمان بـۆ دەردەکـەوێت . کـە بـەرزترین ماددەیـە – هـەر لـە کارەکەی خۆیدا چ جای ئەوەی بتوانێت شـت دروست بکات یان شت ببەخشێت:

أ. زاناکـان توانیـان ئامێرێـك دروسـت بکـەن و بـەهۆی ئـەو ئامێرەوە هەرچـی ڕووداوێـك بکەوێتـە سـەر مـۆخ و ئـەو ئامێرە ئاگاداری زاناکان بکات و هەر ئامێرەکە خۆیشی بینوسێت .

ئەو خاوەنی مۆخە هەرچی جوڵەیەکی بکردایە یان کاغەزێکی بدڕاندایە یان ئەندامێکی لەشی بجوڵاندایەو هەر جۆرە شتێکی بکردایە ئەم ئامێرە ئاگاداری زاناکانی ئەکردو هێمای ئەو کارەی ئەدا... بەڵام چەندە هەوڵیاندا بۆ ئەوەی هێمای کارە بیریەکان و چالاکی بیرەوەری ( نشاط فكري ) یەکانی بدات، نەیئەتوانی، کەواتە بۆ هەر کارێك پەیوەندی بە جیهانی ماددیەوە هەبوایە هێمای ئەدا بەڵام بۆ کارێك پەیوەندی بە بیرکردنەوەوە هەبوایە

---

[21] مامۆستا عمر تۆفیق لە کتێبی – یەکبوون – ل١٠ دا ئەڵێ ( مێشك بەرزترین و بەنرخترین پلەی ماددەیە بەڵام مامۆستا عمر دروستکەری مێشك ناو ئەنێت ( گەردون ) و ئەڵێت ( کە دەستی گەردون دروستی کردووە ). دەستی گەردون !!.

ئامێرەکە ڕا ئەوەستا [22]. ئەمەیش لەبەر ئەوەیە چونکە مۆخ تەنها بریتیە لە ئاوێنەیەك بۆ جیهانی ژیری و بیرکردنەوە و، مۆخ ژیری نیە.... تەنانەت بۆ هەڵسوڕاندنی کارەکەی خۆیشی – کە بیرکردنەوەیە – پێویستی بە هێزێکی میتافیزیکیە کە ئەویش ژیری (عقل)ە .

ب . پاش ئەوەی کە پزیشکەکانی برینساز (الجراحین) توانیان دەستکاری مۆخی مرۆڤ بکەن و ئەگەر لە کار کەوتبێت لێی ببڕن و لێی فڕێ بدەن... جا لەگەڵ ئەو بە هەزاران نەخۆشەی لە مۆخیان بڕدراوەو فڕێ دراوە، هیچ توشی کەم بیری یان شت لە یاد چوونەوە نەبون... خۆ ئەگەر ڕاست بوایە بیرەوەری تۆماری سەر مۆخ بوایە ئەبوایە بە لابردنی هەر پارچەیەك مۆخ لە مێشك ئادەمیزاد کەلێنێکی گەورەی لە ئەرشیفی بیرەوەری مرۆڤدا دروست بکردایە... کەچی واش نیە و... هیچ توشی شت لەیاد چوون نابێت [23]... کەواتە ژیری مۆخ نیەو باڵا دەست ترە لە مۆخ و مۆخ خۆی دەستەوسانە لە هەڵسوڕاندنی کارەکەی خۆیدا کە بیرکردنەوەیە بەهۆی ژیریەوە ئەبێت کە ژیریش تیشك و پرشنگی گیانە.

---

[22] ایماننا بالله بین الفکر المطلق والقرآن العظیم ، للشیخ محمود محمد غریب ، ص٨ .

[23] سەیری کتێبی گەشتەکەم لە گومانەوە بۆ باوەڕ ل٢٦ بکە .

ج. جا ئەگەر بەنرخترین و بە دەسەڵاتترین ماددە لە بونەوەردا بەو جۆرە بێت ئیتر ئەبێت چ ماددەیەك هەبێت بتوانێت شت دروست بكات !! ؟؟. دیاریە كە هیچ ماددەیەك نە ئەتوانێت شت دروست بكات یان خۆی دروست بكات وە نەئەتوانیٚ شت ببەخشێت.

د. كاتیٚ ئێمە ئەڵێین ئەو شتە خۆی خۆی دروست كردووە، مانای ئەوەیە ئەبێت لە نەبونەوە خۆی خۆی هێنابێتە بون... بەلاٚم شتێك كە خۆی نەبێت چۆن ئەتوانێت لە جیهانی بوندا پەل بهاویٚ ؟

هـ. تا ئێستا چەند جار زاناكانی سەردەم هەوڵیانداوە بۆ ئەوەی بتوانن تاقە (خانە - سێلْ - خلية)یەكی زیندوو دروست بكەن.. بەو هەموو زانیاری و دەسەلاٚت و ژیری ئەلكترۆنی سەدەی بیستەوە و بەو هەموو كەرەستە زۆرەی لەبەردەستیاندا هەیە، نەیانتوانی تاقە خانەیەك دروست بكەن.. ئایا ماددەی بیٚ ژیری و وێلْ چۆن ئەتوانیٚ خۆی خۆی دروست بكات.. ؟ یان بەرێكەوت دروست ئەبیٚ.. ؟ لەم بەڵگە زانیاریانەی سەرەوە بۆمان دەرئەكەوێت كە هەرگیز ماددە ناتوانێت خۆی خۆی دروست بكات.

**کەواتـە ئـەو سروشـتەی بتوانێـت شـت دروسـت بکـات نابێـت ماددە بێت بەڵکو ئەبێت هێزێکی ئەودیوو ماددە (ما وراء المادة) بێ.**

**٢. وا زانیاری سەلماندی کە سروشت ئەگەر دروستکەر (خالق) بێت، ئەبێ هێزێکـی بە دەسـەڵاتر بـێ لـە مـاددەو هەڵسوڕێنەری مـاددە بـێ... جـا بـا بـزانین ئـەو هێـزە هێزێکـی دانـاو بـەتواناو بیسەرە، یان هێزێکی نابیناو کەڕو کوێرە کە ئەمەیش مەبەستی وشـەی – سروشـت – لای ئەوانـەی ئەیانـەوێ خۆیـان بـە وشـەی (خـوا) کـەڕ بکـەن و خوایـەکی نابینـاو کـەڕو کـوێری وەکـو (طبیعة)یـان بۆ خۆیـان تاشیوەو لە باتی (هوبەل و عوززا)کەی ئەوسـا داوای هـەموو شـتێك و چـاوەڕێی هـەموو شـتێك لـەو (طبیعة)وە ئەکەن. داروین ( Darwin) لە کتێبی – التطور– دا ئەڵێ (سروشت هەموو شتێك دروست ئەکات و دەسەڵاتێکی بێ سـنوری هەیـە) وە دیـسان هـەر لـەو کتێبەیـدا ئـەڵێ (سروشـت کوێرانە پەل ئەهاوێ و دوورە لە هەموو یاسایەکەوە)[٢٤].**

---

[٢٤] کتێبی ( ڕێکەوت لە تەرازووی ژێریدا ل٣٩ ) وتومە داروین باوەڕی بە بونی خوا بووەو لە کتێبی ( قصة الایمان – ندیم الجسر ص١٨٧ – ١٨٨ ) دا وەرمگرتووە ، ئەوە ڕاستە بەڵام ڕاستتر ئەوەیە لەم دواییەدا صەهیۆنیزم توانیان داروین و بیردۆزیەکانی بکەن و بەکاری بێنن بۆ ڕوخاندنی هەموو ئاینێك سەیری کتێبی ( نظریة داروین بین الفکر والقرآن ، محمد علی الفلاحی ص٩ ) بکە . لە دوای ئەو کڕین و فرۆشتنە ئیترلە

ئەمە نەك تەنیا داروین و قوتابیانی داروین ئەم بتەیان بۆ خۆیان تاشیوەو لە جێی خواکەیان دایان ناوە، بەڵکو زۆر لە ئێمەیش کە شوێنکەوتەی ئەوانین و لە هەموو شتێکدا یەکسەر لاساییی ئەوان ئەکەینەوە ئەم خوایەمان بۆ خۆمان تاشیوەو هەر بە منداڵی ساواکانمانی پێ گۆش ئەکەین و بەم وشە بت پەرستیە زۆربەی کتێبەکان و لاپەڕەکانی گۆڤار و ڕۆژنامەو چاپەمەنیەکانی تریش ناواخن خراون و پڕ کراون.

منیش ئەڵێم:

أ. وا ئێمە کۆنە پەرست و دواکەوتوین... بەڵام با ئەو پێشکەوتوو ڕۆشنبیرانەی ئێمەو ئەوانەی ئەورووپاش پرسیار بکەن لە پیاوە ژیرەکانیان و لە مامۆستا پرۆفیسۆرەکانیان و خاوەنانی شەهادەی دکتۆرایان... چونکە ئەوان بیر تیژن هیچ قسەیەك ناکەن و هیچ وتەیەك لە دەمیان ناترازێ هەتا جێگای وتەکەیان نەکەنەوە و بە تەرازوی زانیاری نەیکێشن با پرسیاریان لێ بکەن و بڵێن: ئەو سروشتەی کە خۆی کارەکانی هەڕەمەکی بێت و دووربێت لە ژیریەوە چۆن ئەتوانێت ئێمەی

---

ئاینی باو باپیری کە - فلایی - بوو پەشیمان بویەوەو باوەڕیشی بە بونی خوا نەماو لە پەنای سروشت گەڕیداو بەناوی زانیاریەوە إلحادی بڵاو ئەکردەوە هەتا دۆخێکی سازگار بۆ جۆرەکان ئەنجام بدات .

خاوەن ژیری دروست بکات.. ؟ ئەو کە خۆی ژیری نیە چۆن ئەتوانێت ژیری ببەخشێت بە ئێمە.. ؟ کەسێك خۆی شتێکی نەبێت چۆن ئەتوانێت لێی ببەخشێت..؟ چۆن ئەبێت دروستکراو بەرزتر بێت لە دروستکەر.. ؟ ئەو مرۆڤەی کە سروشت دروستی کردووە و شتی پێ بەخشیوە، هەموو هەڵسوکەوتێکی بە پێی یاسایەکی ڕێك و قەشەنگ و وردە، کەچی خواکەی – سروشت = (شەرم کوێرم ناپارێزم) کارەکانی ئەکات... ئەمە ڕاستە.. ؟ !

ڕاستیەکەی ئەمە ئەو هەتیتەیە بوو ئەوروپاییەکانی تێکەوت کاتێ لە دەستی چەپەڵی کڵێسەو پیاوانی کڵێسە هەڵاتن و باوەڕیان بە خوا نەما، ئەمجا خوایەکیان بۆ دروستکەری بونەوەر تاشی و ناویاننا (سروشت).

ب. ئەگەر چاوێك بخشێنینەوە بە تیۆری یەکەمی باسەکەمان (بونەوەر بێ یاسایە) و – کە نەختێك لەسەر یاسای بونەوەر دواین – وە ئەو یاسا ڕێك و ناوازەیەی لەم بونەوەرەدا هەیە، بیخەینە تەرازووی ژیریەوە – خۆشمان بێ هۆش نەکەین – و بە ژیریەکی بێ لایەن سەیری ڕاستی مەسەلەکە بکەین و بڕیار دەربکەین بەرامبەر وشەی – سروشتی دروستکەری بونەوەر- لەو باوەڕدا نیم هەرگیز ژیریمان ڕێگەی ئەوەمان بدات بڵێین، سروشتێکی دوورلە یاساو کەڕو کوێر بتوانێت ئەم بونەوەرە پڕ

لەیاسا رێکو پێکە ئەنجام بدات و دروستی بکات... ژیری ئەڵێ هەموو کات ئەبێ نەخشەی دروستکردنی خانویەك بە مێشکی خاوەن ژیریەکدا بێت – گەرچی کەرەستەکەیشی ئامادە بێت – ئەمجا ئەو ژیرە دەست ئەداتە دروستکردنی خانووەکە، خانوویەکی سادەی بێ نرخ.. !! ئەی ئەم بونەوەرە فراوان و ناوازەیە پێش دروستکردنی پێویستی بە خاوەن ژیریەك و نەخشەکێشێك نیە.. ؟ ئێوەو ویژدانتان هەرگیز هێزێکی ئاڵۆزی دوور لە ژیری ئەتوانێت ئەم یاسا وردەو ئەم دیمەنە جوانەو ئەم وردەکاریە قەشەنگە دروست بکات.. ؟؟؟

بونی ژیریەکی بەهێز لەم بونەوەرەدا بە تایبەتی ژیری – عقل –ی ئادەمیزادو ئەم یاسا وردەی بونەوەر هەموو سروشت پەرستەکان ئەخاتەوە بە درۆیەوەو پێیان ئەڵێن (نابێت سروشتێکی بێ ژیری و هەرەمەکی ئەم بونەوەرەی دروست کردبێت).

٣. بەم شێوەیە بۆمان دەرکەوت کە – سروشت – ئەگەر ماددەو کۆمەڵەی ماددە بێ ناتوانێ شت دروست بکات و ئەم بونەوەرە ئەنجام بدات... وە دیسان ئەگەر مەبەستیان لە (سروشت) هێزێکی میتافیزیکی یەو بەلام هەر بۆ ئەوەی لە وشەی (خوا) رابکەن ئەڵێن ئەم هێزە نابیناو کەرو کوێر و هەڵشەو واشەیە..

دیسان ئەم هێزەیش ناتوانێ – وەکو لە پێشەوە باسمانکرد – ئەو ژیریەی ئادەمیزاد و ئەو یاسا شیرینەی لەم بونەوەرەدا هەیە، دروست بکات.

لێرەدا هیچ چارەیەك نیە بۆ ئەوان تەنیا ئەوەندە نەبێ، کە خۆیان بدەن بە دەستەوەو بڵێن – هێزێکی بە دەسەڵاتتر لە ماددەو بەهێزتر لە هەموو بونەوەر ئەم بونەوەرەی دروستکردووە و ئەو هێزەیش بینەرو بیسەرو زاناو بەتواناو ئاگادارە لە هەموو هەڵسوکەوتێکی پارچەکانی ئەم بونەوەرە هەر لە بچوکترین ئاتۆم هەتا گەورەترین کەشکەشانی گەردون... بەناچاری و بەزۆر ئەبێ ددان بەم ڕاستیەدا بنێن و بڵێن ئەبێ ئەو هێزە بەدەسەڵاتە زاناو توانایە ئەم بونەوەرەی دروستکردبێ.

جا کاتێ من لە کتێبی (ڕێکەوت لە تەرازووی ژیریدا ل٣٥) ئەڵێم (سروشت هەر مانای خوایە) و هەندێ لەوانەی نە بەژیری خۆیان بیر لە شت ئەکەنەوەو نە بە چاوی خۆیان سەیری شت ئەکەن و نەبە بیری خۆیان شت تەتەڵە ئەکەن ڕەخنەم لێ ئەگرن... من مەبەستم ئەو سروشتە زانا بە توانا بیسەرەیە لەم خاڵی سێهەمەدا باسمانکرد... کە ئەمەیش هەر (خوا)کەی خۆمان ئەگرێتەوە و تەنیا وشەی (خوا)یان گۆڕیوەتەوە بە ووشەی (سروشت)... گۆڕینەوەی وشەیە و هیچی تر.

کاتێ داروین ئەڵێ (سروشت هەموو شتێك دروست ئەكات و دەسەلاتێكی بێ سنوری هەیە)، ئایا ئەگەر وشەی (سروشت) بكوژێنینەوە و ووشەی (خوا) دابنێین تەواو دەرناچێت... ؟ كەواتە ڕاستە ئەمە ڕاكردن و هەلاتنە لە وشەوە بۆ وشە لە(خوا) وە بۆ وشەی (سروشت) ئیتر (داروین) و نمونەی داروین هیچ پاڵەوانیەتیەكی زانیارییان بەكارنەهێناوە تەنیا ئەوەندە هەیە خوای پەروەردگاری ڕاستیان گۆڕیوەتەوە بە بتێك – ئەویش تەنیا لە جیهانی ئەندێشەدا و – ناویان ناوە سروشت.

**( خوا ) ئەم بونەوەرەی دروستكردوە**

لەو باسانەی پێشوودا كە گوێمانگرت لە زانیاری و ژیری بۆمان دەركەوت سەرەتایەك بۆ دروستبونی بونەوەر بووەو ئەم بونەوەرە پڕ یاسا ناوازەیە زۆر دوورە لەوەی بە ڕێكەوت دروست بوو بێت، دیسان هەر زانیاری بۆی سەلماندین ئەو سروشتەی لای هەندێ نەزان و هەژار بە دروستكەری بونەوەری دائەنێن ئەگەر مادە بێت ناتوانێ شت دروست بكات و ئەگەر هێزێكی ئەو دیوی ماددەیش بێ هەرگیز ناگونجێ هێزێكی هەرەمەكی و بێ ژیری ناوبنێین – سروشت – و بیكەین بە خواو دروستكەری بونەوەر..

وه بینیمـان چـۆن زانیـاری و ژیـری زۆری کـرد لـه هـهموو سروشـت پهرسـتارهکان بـهوهی کـه ئـهبیْ ئـهو هیْـزهی ئـهم بونهوهرهی دروست کردبیْ هیْزیْکی زاناو بهتواناو به دهسهلاتتر بیْ لـه هـهموو خـاوهن هیْزیْك، کـه ئـهویش هـهر خـوای گـهورهو پهروهردگاری تویْ تویْی دلْیت..

ئهی خـوای گـهوره هـهر تـۆی خـاوهنی بـهرزترین و پیرۆزتـرین ئاوهلْناو (صـفه)یْکی خوایـهتی و شایـستهی ئـهوهی نـهك شـهو و ڕۆژی پیْـنج جـار کڕنوشیت بـۆ بـهرین بـهلْکو و هـهموو تهمـهنمان بهلاره ملیْیـی و گـهردهن کهچییهوه نیْـو چاومان بساویْنه تـۆزو گـهردی مزگـهوتـهکانت و دلْمـان بـه تروسـکاییهك لـه نیْـرراوهو پیرۆزی (قورئان) هکهت ڕوناك بکهینهوه.

ئهی خوای گهوره چۆن لـهتاو دهسـهلاْت و هیْـزی تـۆدا هـهر بـه زمان تهپ و تۆزو گلْ و خـۆلْی کـۆنترین مزگـهوت و داروخـاوترین پهرستگاکانت له دواکهوتوترین لادیْدا نهلیْسمهوهو ڕوی زهرد و بهندایهتیم نهساومه ئهو بهرمالْه پیرۆزانه.

ئهی خـوای گـهوره ئهوانـهی کـه تـۆ ناناسـن، ئهگـهر سـهیری سـادهترین دروسـتکراوهکانت بکـهن زۆر بـه ئاسـانی تـۆ – بـهلْیْ . هەر خۆت – بەدی ئەکەن و ئەتبینن.

بە منداڵی سەر لە ئێواران لەگەڵ هاوەڵەکانمدا ئەڕۆیشتین بۆ سەرشاخ و گردۆڵکەکانی پشتی (سیدصادق)ەوە و کە خۆرئاوا ئەبوو سەیری دیمەنی شەمشەمە کوێرەکانمان ئەکرد سەیرمان ئەکردن چۆن بەیەکدا ئەهاتن...

جاری وا ئەبوو پۆلێکی گەورە خۆیان ئەکرد بەنێو پۆلێکی لە خۆیان زۆرتردا بە تیژی بەناو یەکدا تێ ئەپەڕین، بێ ئەوەی هیچیان لەیەکتری بدەن، یان چەند جار بە دەستی ئەنقەست شەمشەمەکوێرەم ئەگرت و هەڵمئەدا بۆ تەلی تەلەفۆن یان دیوار، کەچی بە هیچ جۆرێك لێی نەئەدا... نەمئەزانی بۆچی ئەو شەمشەمە کوێرە نابینایە نادات لەو تەلە باریکەو چۆن چاوی ئەو تەلەی بەدی ئەکرد.

ئەمە خولیایەك بوو لەسەرمدا هەتا گەورە بووم و بیرم زیاتر فراوان بوو پرسیارم لە مامۆستاکانم ئەکرد نهێنی ئەم شەمشەمە کوێرەیە، تا دواجار پێیان وتم کە خوا ئامێرێکی (ڕاداری) بۆ هەموو شەمشەمەکوێرەیەك دروستکردوە و هیچ شەمشەمەکوێرەیەك نیە ئەم ئامێرەی تێدا نەبێ [٢٥].

هەر بیرم لە وشەی ڕادارو چۆنێتی کارکردنی ئەکردەوە پرسیارم لەم و لەو ئەکرد.. تا دوا پرسیارم هاتە سەر ئەوەی

[٢٥] هذا هو الله ، الاستاذ محمود شبيب ، ص١٨

ئەموت باشە، خۆ ئەم ئامێرەی شەمشەمە کوێرە ئەندازیارێك سەرپەرشتی پاك و تەمیزی و چەورکردن و شوێن و گۆڕینی پارچەکانی ناکات.

بەلام هەموو فڕۆکەیەك پێش فڕینی، زۆر بە وردی ئەندازیارێکی پسپۆڕ سەیری ئەو ڕادارە ئەکات و دڵنیا ئەبێ لە تەواوی و چاکی ئەو ڕادارە و لە سەر تەبەڵەیەکی تایبەتی مۆری تەواوی کارکردنی ڕادارەکە ئەکات ئەمجا ئەو فڕۆکەیە ئەفڕێت، کەچی – لەگەڵ ئەوەیشدا – هەر تاوە نەتاوەیەك بەری گوێمان ئەکەوێت فلانەفڕۆکە کەوتە خوارەوە فیسارە فڕۆکە دای لە چیای فلانی و هەپروون هەپروون بوو... بۆیە منیش لەگەڵ (پیرەمێرد)ی[٢٦] خوا لێ خۆشبوودا ئەڵێم:

خوایە ئەوانەی کە بێ باوەڕن
هیچیان نەدیوە وا هەڵەوەڕن
ئەگینا سەیری باغێکی گوڵ کەن
تەماشایەکی بەعەقڵ و دڵ کەن
ئەو ڕەنگە جوانەی پەڕەی (هەرجایی) [٢٧]

---

[٢٦] پیرەمێردی نەمر مامۆستا هاوار ل٣٧٠.

[٢٧] لە کتێبی ( ڕێکەوت لە تەرازووی زێریدا ل٣٩ ) وتومە داروین باوەڕی بە بونی خوا بووەو لە کتێبی (قصة الايمان – نديم الجسر ص١٨٧ – ١٨٨) دا وەرمگرتووە . ئەوە ڕاستە بەڵام ڕاستتر ئەوەیە لەم دواییەدا صەهیۆنیزم توانیان داروین و

بـــە زەرەبینـــی تیشکی بینـــایـــی
لێـــی ورد بنـــەوە کە ئـــەو صنعـــەتە
کـــێ دەڵـــێ زادەی خـــووی طبیعـــە تـــە. ؟
گەڵای (گوڵپـەسەند) [٢٨] کـام مەقسەد بڕی ؟
(پـەردەی عـەروسی) [٢٩] کێ پەردەی دڕی.. ؟
کـــێ هـــات (لاولاوی) [٣٠] بـــەدار ئـــاڵان.. ؟
کام دەست گەردنی(وەنەوشەی) [٣١] شکان.. ؟

## چۆن ژیان پەیدا بووە ؟

بـۆ وەڵامدانـەوەی ئـەم پرسـیارە گرانـە هـەر لـەدێرین ڕۆژگـاری مێـژووەوە تـا ئـەمڕۆ زانـا فەلـسەفیەکان بـوون بـە سـێ بەشـەوە و خاوەنی سێ پێشنیارن لەم بارەوە:

---

یەردۆزیەکانی بکرن و بەکاری بێنن بۆ ڕوخاندنی هـەموو ئاینێك سـەیری کتـێبی (نظریة داروین بین الفکر والقرآن ، محمد علی الفلاحی ص٩) بکە . لە دوای ئەو کرین و فرۆشـتنە ئیترلـە ئـاینی بـاو بـاپیری کـە – فلایـی – بـوو پەشـیمان بویـەوەو باوەڕیشی بە بونی خوا نەماو لە پـەنای سروشـت گـەریداو بەناوی زانیاریـەوە إلحادی بڵاو ئەکردەوە هەتا دۆخێکی سازگار بۆ جۆرەکان ئەنجام بدات .

[٢٨] ناوی گوڵە .

[٢٩] ناوی گوڵە .

[٣٠] ناوی گوڵە .

[٣١] ناوی گوڵە .

١. هەندێکیان ئەڵێن ژیان یەکسەر لە مادده پەیدا بووە بێ ئەوەی پێویستمان بە دروستکەرو (خوا) هەبێ... ئەمانیش (ماددیەکانن) و بە دوو جۆر ئەم ڕایە شیتەڵ ئەکەن.

أ. یان ئەڵێن بەهۆی یەکگرتنی ئەو ماددانە و ئەو توخمانە بەشێوەی (ڕێکەوت) ژیان یەکسەر لە مادده پەیدابووە.

ب . یان ئەڵێن بەهۆی هێزێکی ناوخۆیی کەلە ماددەدا هەیە ئەو ماددانە خۆیان توانیان ژیان لە خۆیاندا دروست بکەن.

٢. کۆمەڵی دووهەم – نەیانویستووە لەم بارەوە بکۆڵنەوە یان کۆڵاونەتەوە بەلاّم نەگەیشتوونەتە ئەنجام وازیان لێ هێناوە و بە وشەی (نازانم) وەلاّمیان داوەتەوە.. وتویانە ئێمە نازانین چۆن ژیان دروستبووە... ئەمانە پێ یان ئەوترێ (خاوەن گوماتن – المترددون) تەنانەت پێشنیاریان بەرامبەر بونی خوایش هەر بەو جۆرە بووە... نەتوانیویانە بلێن هەیە وە نە توانیویانە بڵێن نیە.

٣. کۆمەڵی سێهەم – کە ڕێژەی زاناکانیان ٩٢٪ ی زاناکانن [٣٢] ئەڵێن... ژیان لە مادده دروستبووە بەلاّم نەك بەهێزی ناوخۆیی مادده یان بەڕێکەوت، بەڵکو بەهێزێکی دەسەلاّتی دروستکەرێکی بالاّ – کە خوایە – و خاوەنی زانیاریەکی بێ سنورو ئارەزویەکی فراوانە.

---

[٣٢] العلم لیس کلافرا ، د.محسن عبدالحمید ص١٠ .

وێنەی ئەم سێ کۆمەڵە زانایەم وەکو دیمەنی ئەو فڕۆکە بێ فڕۆکەوانە دێتە پێش چاو کە لەکاتی خۆیدا هەر بیرم لێ ئەکردەوە.

لە هێرشە ناڕەواکەی ئیسرائیل بۆ داگیرکردنی بەری ڕۆژئاوای (ئوردن) لە حوزەیرانی ١٩٦٧ دا من سەرباز بووم لە (کەرکوك) ئێوارەیەك (سەر لقە = أمر السرية)کەمان کۆی کردینەوە وتی (ڕاپۆرتێکمان) بۆ هاتووە و ئەڵێ:

(دوێنێ بەیانی فڕۆکەیەکی سووسەکەر (استطلاع) بەسەر (کەرکوکدا) گەڕاوەو لەوانەیە دوژمن بۆردومان بکات... ئاگاداربن و سەنگەر هەڵبکەنن و... هتد...).

وە کاتێ باسی ئەم فڕۆکەمانە لێ پرسی وتی (ئەم فڕۆکەیە بە بێ فڕۆکەوانە ئەفڕێ و بۆ ئەو شوێنەی بیانەوێ ئەڕوات و وێنە و نەخشەی پێویست ئەگرێ و بە پێی پێویست بەرز و نزم ئەبێتەوە و ڕووی ئەچەرخێنێ... هەر خۆی بێ فڕۆکەوان ئەمانە ئەکات و ئەگەڕێتەوە شوێنی خۆی، هیچ کەسێکیشی تێدا نیە... بەلآم لە ڕاستیدا زانایەك – یان چەند زانایەك – لەو وڵاتەی ئەو فڕۆکەی ناردووە، بە هێزی ئامێری ئەلکترۆنی و زانیاری ئەمانە هەموو بەو فڕۆکەیە ئەکات و... هتد...).

لێرەدا من بیرم لەم فڕۆکەیە ئەکردەوە و ئەموت – ئەگەر ئەو فڕۆکەیە بخرێتە خوارەوە و خەڵکی بڕۆن بۆ سەیری کەلاکەکەی بۆیـان دەربکـەویٚ ئـەم فڕۆکـە، فڕۆکـەوان و شـۆفێر و هـیچ کەسێکی تێدا نەبووە – ئەبیٚ ڕای ئەو خەڵکە بەرامبەر بەو فڕۆکەیە و چۆنێتی کارکردنی ئەو فڕۆکە چی بێت.. ؟

زۆر دیارییە ئەبن بە سیٚ کۆمەڵەوە و ئەبنە خاوەنی سیٚ ڕا:

١. هەندێکیان ئەڵێن ئەم فڕۆکەیە هەر لە خۆیەوە و بە هێزێکی ناوخۆیی ئەڕوات بە ڕێکەوت ڕێی کەوتووەتە ئێرە.

٢. هەندێکی تریان بە وشەی (نازانم) وەڵامەکانیان ئەدەنەوەو ئەڵێن نازانین چۆن بەبیٚ فڕۆکەوان فڕیوە.. ؟ !!

٣. هەندێکی تریان هەرگیز لەو بڕوایەدا نەئەبون ئەم فڕۆکەیە بـیٚ سەرپەرشـتی کـردن بـەو شـێوەیە بـەڕەڵلاٚ بکرێـت... بـیٚ ژیریەکی زانا بەو شێوەیە کاربکات و بفڕێت و بنیشێتەوە [٣٢].

جا من ڕایی ئەو سیٚ کۆمەڵەیەی پێشەوە – لە بابەت چۆنێتی پەیدابونی ژیانەوە – م وەکو ئەم سیٚ وەڵامەو کاتی کەوتنی ئەم فڕۆکەیە دێتە پێش چاو .

---

[٣٢] سەیری اضواء من القران علی الانسان و نشأة الکون و الحیاة ، عبدالغني الخطیب ، ص ١٧٦ بکە .

١. کۆمەڵی یەکەم: ماددیەکانن، چونکە هەرچی بەر هەستیان نەکەوێت، بە بونی دانانێن و ئەڵێن بە ڕێکەوت دروست بووە یان بەهێزێکی ناوخۆیی پەیدابووە.

ا- بەڕاستی ئەم ماددییانە زۆر سەیرن، کاتێ باسی چۆنێتی پەیدابونی ژیان و ساردبونەوەی زەوی، یان دروستبونی یەکەم خانە ئەکەن ئەڵێی خۆیان لەسەر کورسیەك دانیشبون و ئاگاداری هەموو ڕوداوەکە بون و[٢٤]... نازانن کە شوێنی تیۆرێك کەوتون لە سەدا هەشتای دوورە لە ڕاستیەوە.

ب . لە پێشەوە وتمان تەنیا بۆ دروستبونی یەك تاقە گەردی پرۆتینی کە بە ڕێکەوت دروست بێت پێویستمان بە ملیۆن جار ئەوەندەی ئەم بونەوەرە ماددەی تر هەیە وەکو پێویستمان بەوەندە ساڵ هەیە کە زیاتر بێ لە هەموو تەمەنی بونەوەر، بۆ پێکهاتنی ئەم تاقە گەردە.

ج- دیسان زانیاری بۆی سەلماندین کە ماددە ناتوانێ خۆی خۆی دروست بکات وە ماددە خۆی ژیری و زانیاری و سەلیقەی نیە بتولنێ – بەو هێزە ناوخۆییە...خۆی خۆی دروست بکات یان ژیان بە خۆی ببەخشێت.

---

[٢٤] سەیری ڕۆژنامەی ( بیری نوێ ژمارە (٢٣٧) ١٩٧٩/٤/٢٢ ( وە مامۆستا فوئاد حەمە ڕەشید) بکە ..

د. زانیاری ئەڵێ کاتێ زەوی لە خۆر جیابوویەوە پلەی گەرمی بە شێوەیەك بوو هەموو زەوی وەکو پشکۆیەك وابوو، چونکە پلەی گەرمی سەر زەوی وەکو پلەی گەرمای سەر خۆر وابوو کە بریتیە لە (دوانزە هەزار پلەی فەهرەنایتی) هەمومان ئەزانین ژیان بێ هەوای ئۆکسجین نابێ... وە زۆر ستەمێکی زانیاری و ژیریە لەو ناو پشکۆیەدا تاقە ئاتۆمێك ئۆکسجین و هایدرۆجین بمێنێتەوەو نەسوتێ... چونکە ئۆکسجین خۆی بنەڕەتی ئاگرە، وە ئەو ئاگرەیش بێ هەوا ناسوتێ... هەوای هایدرۆجین هەروەکو یارمەتی سوتان ئەدات، خۆشی ئەسوتێ... بەتایبەتی ئەو پلە گەرما فراوانەی زاناکان باسی ئەکەن چۆن ماوە ئەدات بە مانەوەی یەك تاقە ئاتۆم ئۆکسجین یان هایدرۆجین ؟ چۆن هەمووی ناسوتێ ؟.. ئەگەر هەمووشی سوتا دوایی ئەم هەوایە لە کوێوە هاتەوە... ؟ ئەی ئاو چۆن دروست بوو..؟ خۆ بە گەواهی زاناکانی گەردونزانی هەموو پارچەکانی کۆمەڵەی خۆر – بەڵکو هەموو پارچەکانی بونەوەر – یەك ئاگر بون لە گەرمیدا، نە ئاوو نە هەوا و نە هیچ کەرەسەیەکی ژیانیان تێدا نەبووە [٣٥].

٢. کۆمەڵی دووهەم: کە هیچ لە دەسەڵات و توانای خوا نازانن و ژیریش ڕێگای نەبونی خوایان نادات، نە ئەوەیە – وەکو

[٣٥] اضواء من القران على الانسان و نشاة الكون و الحياة ص١٤٧ . .

موسڵمانەکان بڵێن – خوا دروستی کردووە وە نە ئەوەیشە – وەکو ماددییەکان – بڵێن لە خۆیەوە دروستبووە. بەو شێوەیە لەناو گوماندا ماونەتەوە.

٣. کۆمەڵی سێهەم: کە بە هۆی نێراوەکانی خواوە (دروودی خوایان لەسەربێ) شارەزای دەسەلأت و توانای خوان و ئەزانن، خوا هەرشتێ بیەوێ بیکات لەلای گەلێك ئاسانەو ئەڵێن – ماددە خۆی نە ژیانی تێدا هەیە و نە زانیاری و نە ژیری هەتا بتوانێ ژیان بەخۆی ببەخشێت... بەڵکو بەپێی بەخشندەیی خوا ژیان بەهۆی ماددەوە لەماددەدا دروستبووە و ژیری و زانیاری و ژیانی پێ بەخشیوە [٣٦].

**بەشی دووهەم: چۆنێتی دروستبونی بونەوەر:**

تا ئێرە لە بارەی هۆی دروست بونی بونەوەرەوە دواین و توانیمان بەرێگایەکی زانیاریانە (خوا) و دروستکەری بونەوەری بونەوەر بدۆزینەوە و هەموو بیروباوەڕێکی پوچی نەگونجاو لەگەڵ ژیری و زانیاریدا بەدرۆ بخەینەوە... ئێستا لەم بەشەی دووهەم دا – زۆر – بە پەلە باسێکی چۆنێتی دروستبونی ئەم

[٣٦] داواکارم خوا یارمەتیمان بدات بۆ نوسینی کتێبی ئایندەمان بە ناونیشانی ( داروین لە تەرازووی ژیریدا ) بەڵکو تیشکێك بهاوینە سەر ڕاستی ئەم باسە .

بونەوەرە ئەکەین و وتەکانی قورئانی پیرۆز و زانیاری – لەم بارەوە – بەرامبەر ئەکەین.

بەڵام پێشەکی پێویستە چەند ئاگاداریەکی گرنگ هەیە لە یادمان نەچێت:

١. قورئانی بەفەڕ کتێبێکی زانیاری ڕووت نیە... بەڵکو کتێبی نەخشەی ڕێگای چوونە لای خواو چاوساغی ڕێگای ژیانە، بەڵام لە زۆر جێگادا داوامان لێ ئەکات لە دروستکراوەکانی خوا ورد ببینەوە، بۆ ئەوەی جێگای دەستی بەهێزی خوای گەورەمان بۆ دەربکەوێ... وە قورئان خۆیشی لەگەڵێ شوێندا پەنجە ڕائەکێشێ بۆ چۆنێتی دروستبونی هەندێ شتی گرنگی بونەوەر و هانمان ئەدا بۆ گەڕان بەدوی هۆی دروستبونەکەیدا... وەکو سەرمەشقێك بێت بۆ ئێمە لەلایەکەوە و لەلایەکی ترەوە بۆ باسکردنی دەرگای لێکۆڵینەوەو گەڕان.

٢. هەندێ لە نوسەرەکانمان بەهەڵەدا چوون و وایان زانیوە ئایینی پیرۆزی ئیسلامیش – وەکو ئایینە دەست لێ دراوەکانی تر – دژی لێکۆڵینەوەی زانیاریەو خوێندنی زانیاریە ئەکادیمیەکانی قەدەغە کردووە.... بۆ نمونە مامۆستا (ڕەئوف حسن) لە کتێبی (گەردون ل٧) دا ئەڵێ (پیاوانی ئایینی وایان ئەزانی – خوێندنی لەیاد چووە – ناگونجێ دژی فەرمودەکانی

پێغەمبەرەو – گوایا ئەو ئایینانە – بە خەڵکی ئەڵێن درۆ ئەکەن ئەوانەی ئەڵێن، باران لە هەڵمی دەریاکان پەیدا ئەبێ و یان کە ئەڵێن زەوی بەدەوری خۆردا ئەسوڕێتەوە، وەکافرن چونکە زمانی کافر ئەخوێنن... وە مامۆستا (ڕەئوف) نایەوێ بەڵگەی زیاتر بێنێتەوە بۆ سەلماندنی بەربەرەکانێی – ئاین و دەست و پێوەندی ئایین – دژی زاناکان چونکە – مەحکمەی تفتیش – ئەمەیان بۆ ڕون ئەکاتەوە.

خوا لە مامۆستا (ڕەئووف حسن) ببورێت و لێی نەگرێت... بەلاّم نازانین ئایا (محکمەی تفتیش) مەلاکانی کوردستان لە خانەقای (بیارە) دایاننابوو... ؟ یان سوتاندنی – برنۆ – بە فەرمانی – غەزالی – بوو لە بەردەرکی (نظامیة)کەیدا..؟. یان (گالیلۆ) لە کام – حوجرەی فەقێ – دا بەند کرابوو... ؟ ئەگەر قورئان دژی پێشکەوتنی زانیارییە بۆچی بۆ بەڵگە تاوانی پیاوانی کەنیسەی مەسیحی و – پاپاکانی ئینجیل – ی هێناوەتەوە ؟ بۆچی کەس ئەتوانێ تاقە هەڵوێستێکی ئیسلام – لە سەرانسەری مێژووی ڕەنگینیدا – بدات بە دەستەوە کە دژی زانست وەستابێ ؟! نازانم ئەم ئایەتەی باسی چۆنێتی باران بارین – هەڵم – ئەکات لە قورئاندا نیە ؟ ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يُزْجِي سَحَابًا ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيْنَهُ ثُمَّ يَجْعَلُهُ رُكَامًا فَتَرَى الْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَالِهِ﴾ النور /٤٣..؟ یان

ئەو ئایەتەی کە ئەفەرمیٚ:﴿ يُكَوِّرُ ٱلَّيۡلَ عَلَى ٱلنَّهَارِ وَيُكَوِّرُ ٱلنَّهَارَ عَلَى ٱلَّيۡلِ﴾ الزمره... ؟ (تكوير) مانای چی..؟ ئاییینی پیرۆزی ئیسلام هیچ کاتیٚ دژی پیٚشکەوتنی زانست نەوەستاوە. مەلاکان بۆیە منالیان نەئەخستە قوتابخانە، چونکە ئەو کاتەی قوتابخانە هاتە کوردستانەوە بنکەیەکی سیخوڕی ئینگلیز بوو، وە ئەگەر سەرژمیٚرییەکی دەرچوانی ئەو قوتابخانانە بکەین... وابزانم زۆربەیان بە سیخوڕی داگیرکەر بەرچاو ئەکەویٚت، وە مەلاکان نەیان وتووە کچ نەڕواتە قوتابخانە بەڵکو وتویانە پیٚغەمبەری مەزن (درودی خوای لەسەر بیٚت) فەرموویەتی (طلب العلم فريظة على كل مسلم و مسلمة) تەنیا ئەوەندەیە ئەڵیٚن پیٚویستە ئافرەت بە ئابڕوو بیٚ نەك بەڕەڵا.

لەگەڵ ئەوەیشدا نابیٚ هەندیٚ لەو مەلایانەی خۆیان ناو ناوە مەلاو سەپیٚنراون بەسەر ئیسلامدا و دورن لە گیانی ئیسلام و مەلایەتی ڕاستەقینە ( وەکو پیٚشەوایەکی گەل) تەنانەت هیچ لە ئیسلام نازانن پیٚشنویٚژییەك نەبیٚ، نابیٚ ئەوانە بە نویٚنەری ئیسلام دابنریٚن و لە ڕوانگەی کردەوەکانی ئەوانەوە بڕوانریٚتە ئیسلام و کردەوەکانی ئەوان فڕیٚ بدریٚت بەسەر ئیسلامدا تەنانەت زۆربەیان دەوریٚکی سەرەکیان هەبوو لە تارنانی لاوەکانمان لە ئیسلام.

٣. ئەو زاراوانەی کە ئێستا زانستی تازە بەکاری ئەهێنێ جیایە لەگەڵ ئەو زاراوانەی قورئان بەکاری ئەهێنێ، بەڵام هەردوکیان یەك مەبەستیان هەیە، بۆ نمونە: زانیاری ئەڵێ ئەم کەشکەشان و گەردون و ئەستێرەو هەتاوانەی بونەوەر لە بنەڕەتدا تۆپەڵە گازێکی چڕو پڕ بووەو لە ئەنجامی خەست بونەوەو گەورەیی قەوارەیی و سوڕاندنەوەیەکی سەرسوڕهێنەردا تەقییەوە، قورئانیش ئەفەرموێ:﴿ أَوَلَمْ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَٰهُمَا...﴾ ((الأنبياء ٣٠)) واتە ئەوە بۆ بێباوەڕەکان سەیری ئاسمان و زەوی ناکەن کاتێ خۆی یەك تۆپەڵە بون لێکمان جیاکردونەتەوە...).

٤. چۆنێتی تەقینەوەو دروستبونی ئەم پارچانەی بونەوەر هەتا دروستبونی زەوی خۆمان و پەیدابونی ژیان و سەوز بونی ڕووەك و هەموو پلەکانی ئەم قۆناغانە لە قورئاندا باسکراوە... بەڵام بە شێوەیەکی پرژوبڵاو ودەربڕینی دەسەڵاتی خوا وە بەشێوەی دەست ڕاکێشان.

٥. لە هەموو سەرانسەری قۆناغەکانی زانیاریدا هەتا ئێستا هیچ فەرمودەیەکی قورئانی پیرۆز دژی هیچ پێشکەوتن و هیچ بەرهەمێکی زانیاری نەوەستاوە بەڵکو شان بە شانی یەکتری ڕۆیشتون و هەتا زانست پێش بکەوێ ڕاستی و وردەکاری

فەرمودەکانی قورئان زیاتر دەرئەکەوێ و پەرچڤە ئەدرێتەوە...
بەلاّم هەندێ تیۆر کە زادەی ئەندێشەن و دوورن لە گیانی زانست
و مۆری زانستیان لیّ دراوە و بەناوی زانیاری و زانستەوە بلاّو
کراونەتەوە... ئەگەر لەگەلّ ڕێبازەکەی قورئاندا نەگونجیّ، ئەو
تیۆرانە فڕێ ئەدرێنەوە بەسەر خاوەنەکانیانداو لە تەرازوی
ڕاستیدا کێشی بۆ دانانرێت. پاش ئەم چەند تێبینییەو پێش
ئەوەی بێینەوە سەر باسەکەمان با گوێ بگرین لە چەند دەقێکی
قورئان، ئەوجا دێینەوە سەر شیتەلّکردنەوەی زانیاری لە بارەی
چۆنێتی و تەنینی ئەم نەخشە ناوازەیەی کە ناوی بونەوەرە:

١. قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ بَدَأَ الْخَلْقَ . (العنكبوت ٢٠).

٢. أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ . (الأنبياء ٣٠).

٣. ثُمَّ اسْتَوَىٰ إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ (فصلت ١١).

٤. وَكَانَ عَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ (هود ٧).

٥. أَأَنتُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَمِ السَّمَاءُ ۚ بَنَاهَا ﴿٢٧﴾ رَفَعَ سَمْكَهَا فَسَوَّاهَا ﴿٢٨﴾ وَأَغْطَشَ لَيْلَهَا وَأَخْرَجَ ضُحَاهَا ﴿٢٩﴾ وَالْأَرْضَ بَعْدَ ذَٰلِكَ دَحَاهَا ﴿٣٠﴾ (النازعات ٢٧. ٣٠).

٦. أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ ثَمَرَاتٍ مُّخْتَلِفًا أَلْوَانُهَا ۚ وَمِنَ الْجِبَالِ جُدَدٌ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ ﴿٢٧﴾ وَمِنَ النَّاسِ

وَٱلدَّوَآبِّ وَٱلْأَنْعَٰمِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ كَذَٰلِكَ ۗ إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُا۟ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ ﴿٢٨﴾ (فاطر ٢٧ . ٢٨).

٧. وَٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ ٱلرِّيَٰحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَسُقْنَٰهُ إِلَىٰ بَلَدٍ مَّيِّتٍ فَأَحْيَيْنَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا ۚ كَذَٰلِكَ ٱلنُّشُورُ ﴿٩﴾ (فاطر ٩).

٨. أَمْ خُلِقُوا۟ مِنْ غَيْرِ شَىْءٍ أَمْ هُمُ ٱلْخَٰلِقُونَ ﴿٣٥﴾ أَمْ خَلَقُوا۟ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ۚ بَل لَّا يُوقِنُونَ ﴿٣٦﴾ (الطور ٣٥. ٣٦).

٩. فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَٰنُ مِمَّ خُلِقَ ﴿٥﴾ خُلِقَ مِن مَّآءٍ دَافِقٍ ﴿٦﴾ (الطارق ٥. ٦)

١٠. وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴿١٢﴾ ثُمَّ جَعَلْنَٰهُ نُطْفَةً فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿١٣﴾ ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا ٱلْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا ٱلْمُضْغَةَ عِظَٰمًا فَكَسَوْنَا ٱلْعِظَٰمَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ ۚ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَٰلِقِينَ ﴿١٤﴾ (المؤمنون ١٢. ١٤).

١١. وَهُوَ ٱلَّذِى مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَجَعَلَ بَيْنَهُمَا بَرْزَخًا وَحِجْرًا مَّحْجُورًا (الفرقان ٥٣).

١٢. ٱنظُرُوا۟ مَاذَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَمَا تُغْنِى ٱلْءَايَٰتُ وَٱلنُّذُرُ عَن قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ (یونس ١٠١).

**بەدەستی ئەنقەست مانای ئایەتە پیرۆزەکانم نەکرد... چونکە ئایەتەکان زۆر زانیاری قوولن و پێویستییان بە لێدوانێکی بەربلاو هەیەو ئێمەیش لێرەدا ماوەی ئەوەمان نیە... جا بۆ**

ئەوانەی ئەیانەوێ بەراوردێکی ئەم ئایەتانە بکەن لەگەڵ وتەی زانستی تازەدا، داواکارم سەیری مانای ئەم ئایەتانە لە تەفسیری (المنار – محمد عبده) یان کتێبی (التفسير العلمي للايات الكونية – حنفي أحمد) یان تەفسیری (في ظلال القران – سيد قطب) یان تەفسیری (التفاسير الواضح – د.محمد محمود الحجازي) بکەن... چونکە ئەم تەفسیرانە بە گیانێکی هاوچەرخ ڕاڤەی ئایەتەکان ئەکەن.

جا ئێستا با بێینەوە سەر باسەکەمان و بزانین ئەم دیمەنە جوانەی بونەوەر و ئەم بونەوەرە چۆن پێکهاتون و جیاوازی نێوان ئاسن و لۆکە و ئاووهەواو ئاگر و نەوت و شلە و ڕەقەو گاز و... هتد.... چییە..؟ چۆن ئەم دیمەنە پێکهاتوە... ؟ پاش ئەم لێکۆڵینەوەیە بۆمان دەرئەکەوێ کە ئەم بونەوەرە چۆن بە یاسایەکی زۆر ورد دروستکراوەو هەر لە چڵە پوشێکی بێ نرخ هەتا گەورەترین شت، بریتییە لە دیوارێکی قەشەنگ و وەستایەکی شارەزا دروستی کردووە. ئەو کاتە هەندێکی کەممان لە گەورەیی خواو، بێ نرخی ماددەو سروشتمان بۆ دەرئەکەوێ ئەوسا ئەزانین هەر کەسە بڵێ (ئەم بونەوەرە بێ خوایە) یان شێتە یان بەکرێ گیراوی ئەوانەیە کە چاویان بڕیوەتە خێرو بێری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و وڵاتە

ئیسلامیه‌کانمانه‌وه... ئه‌گه‌ر چی به هه‌زاران مۆری دروستکراوی زانستیش بدات له خۆی و دروشمی ڕه‌نگاوڕه‌نگ و قه‌به هه‌ڵبواسیٚ.

**ئاتۆم : Atom**

هه‌ر که سه‌یری کۆمه‌ڵه کتێبێکی کوردی ئه‌که‌یت و لێیان ئه‌خوێنیته‌وه سه‌یر ئه‌که‌یت هه‌ر یه‌که‌یان تامێك ئه‌ده‌ن، به‌ڵکو له‌وانه‌یه هه‌ریه‌که‌یان مرۆڤ بخاته جیهانێکی تایبه‌تییه‌وه و جیا له جیهانی ئه‌و کتێبه‌ی تری ته‌نیشتی، کاتیٚ که بیری چۆنێتی دروستبون و داڕشتنی ئه‌و کتێبانه ئه‌که‌یت سه‌یر ئه‌که‌یت ئه‌و هه‌موو کتێبانه هه‌ر له‌و پیاته دروستکراون و ته‌نراون که زمانه‌که‌مانی لیٚ پێك هاتووه، هه‌روه‌ها ئه‌گه‌ر به چاوێکی زانیارییه‌وه سه‌یری ئه‌م بونه‌وه‌ره پان و پۆڕه و ئه‌م دیمه‌نه جوانه‌ی بکه‌ین، سه‌یر ئه‌که‌ین هه‌موو بونه‌وه‌ر له ئاتۆم یان (ئه‌تۆم) پێك هاتووه، وه ئاتۆم بچوکترین پارچه و که‌ره‌سه‌ی ئه‌م بونه‌وه‌ریه که به عه‌ره‌بی پێی ئه‌وتریٚ (ذرة) وه ئه‌م وشه‌یه مانای پارچه‌یه‌ك ئه‌گه‌یه‌نیٚ که ئه‌و پارچه‌یه به‌ش نه‌کرێت... به‌ڵام له‌م ساڵانه‌ی دوایی یه‌دا زاناکان توانیان ئاتۆم له‌ت بکه‌ن و پارچه

پارچەی بکەن [٣٧]، تەنانەت ئەو پارچانەو چەندێتی ژمارەی ئەو پارچانە نهێنی چۆنێتی دروستبونی ئەم بونەوەرەن.

ئاتۆم لە چەند پارچەیەکی زۆر زۆر ورد پێك هاتووە، لەنێو چەقی ئاتۆمەکەدا پارچەیەك هەیە و پێی ئەڵێن (پرۆتۆن $P^+$) وە خاوەنی بارگەیەکی کارەبایی گەرم (پۆزەتیڤ)ە. لەناو ئەم چەقەدا چەند پارچەی تر هەیە وەکو (نیوترۆن = N ) کە خاوەنی بارگەیەکی بێ لایەن (نەسالب و نە موجەب)ە. وە لە دەرەوەی چەقی ئاتۆمەکەوە پارچەیەکی تر هەیە و لە خولگەیەکی تایبەتی خۆیدا بە تیژیەکی سەرسوڕهێنەر ئەسورێتەوە و پێی ئەڵێن (ئەلیکترۆن = $e^-$) وە خاوەنی بارگەیەکی کارەبایی سارد (نەگەتیڤ)ە [٣٨].

کێشی ئاتۆم ئەگۆڕێ بە پێی کێشی پرۆتۆن و نیوترۆنەکانی نێو ئاتۆمەکە چونکە کێشی نیوترۆنەکە بە ئەندازەی کێشی پرۆتۆنەکەیەو ئەم دووپارچەیەش کێشی سەرەکی ئاتۆمەکە ئەدەن، زاناکان بۆیان دەرکەوتووە کەکێشی (پرۆتۆن) بریتییەلە (١,٦×١٠^-٢٤)، واتە ئەگەر گرامێك بکرێ بە ملیۆنێك ملیار

---

[٣٧] سەیری نامیلکەی ( ئایا قورئان دانراوی محمدە ... ؟ ) ل٤٢ بکە . .

[٣٨] قورئان ئەفەرمێ( وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ / الذاريات - ٤٥ ) تەنانەت لە ئاتۆمیشدا ..

پارچـــەوە، پرۆتـــۆن بـــە ئەنـــدازەی یـــەکێك لـــەو پارچـــانە کێشەکەیەتی. بەڵام ئەلیکترۆن زۆر لەوە سووکترە چونکە پرۆتۆن (١٨٣٧) ئەوەندەی ئەلیکترۆن قورسترە.

هـەروەها وەکـو کێـشی پرۆتـۆن و نیوترۆنەکە وەکـو یـەکن... هـەر بـەو جـۆرەیش بارگـەی کارەبـایی ئـەلیکترۆن و پرۆتۆنەکـە وەکو یـەکن لـە بڕدا کەئەویش بریتییـە لـە ($١,٦ \times ١٠^{-١٩}$) کۆڵۆم [٣٩].

خـۆ تیـژی خولاندنـەوەی ئـەم ئەلیکترۆنـە بـە دەوری ناوکـدا زۆر جێگای سەرسوڕمانە زاناکان ئەڵێن ڕێـژەی تیـژی سوڕاندنەوەی ئەلیکترۆن بە دەوری ناوکدا لە چاو تیژی تیشکدا بریتیە لەسـەدا یـەك ١/١٠٠، خـۆ دیـارە تیـژی(خێرایـی) تیـشك لـە یـەك چـرکەدا بریتییە لە (٣٠٠ هەزار کیلۆمەتر) کەواتە تیژی ئەلیـکترۆن لە یەك چرکەدا بریتییە لە سێ هەزار کیلۆمەتر [٤٠].

لـەڕووی قـەوارەوە ئـاتۆم هێلکـەیی هەڵکـەوتووە بـەڵام تیرەیـەکی ئێجگار بچوکی هەیە چونکە بریتییە لە ($١٠^{-٨}$ سم) ،
واتە :( ١ لەسەر سەد ملیۆنی )ی سانتیمەترێك.

---

[٣٩] یەکەیەکی بارگەی کارەبایی .

[٤٠] الطب محراب للایمان ، الجزء الاول ، ص٢٦ .

سەرەڕای ئەم سێ پارچەیە، لەنێو ناوکی ئاتۆمدا چەند پارچەیەکی تری تێدایە وەکو (پۆزیترۆن)و (فۆتۆن) و... هتد، هەر وەکو لە خشتەی ژمارە (١) دا .

پارچە سەرەکیە نەگۆڕە دیاریی یەکانی نێو ئاتۆم(گەردیلە):

| ئاتۆم (پارچەیەك) | نیشانە | بارگە | بارستایی | بارستایی× |
|---|---|---|---|---|
| ئەلکترۆن electron | −e | ١. | ٠,٠٠٠٥٥ | ١ |
| پرۆتۆن proton | p ،Hi | ٢+ | ١.٠٠٧٣٢ | ١٨٣٦ |
| پۆزیترۆن positron | $B^{+}$ $^{+}e$ ،$e_{+1}$ | ٢+ | ٠,٠٠٠٥٥ | ١ |
| نیۆترینۆ neutrino | V | سفر | ٢٠.٠٠٠٠٤ | ٠,٠٤ |
| فۆتۆن photon | V | سفر | سفر | سفر |
| گرافیتۆن graviton | G | سفر | سفر | سفر |
| ئەنتیپرۆتۆن antiproton | $^{-}P$ | ١. | ١,٠٠٧٣٢ | ١٨٣٦ |

× بە ڕێژەی کێشی ئاتۆمی ئۆکسجین لێك ئەدرێتەوە کە (١٦)یە.

× بە ڕێژەی کێشی ئەلیکترۆن دانراوە کە٩,١١ ×١٠-٢٨ گم

ئەوەی کە جێگای سەرسوڕمانە جێگای دەستی تاقە خوامان نیشان ئەدات و وردەکاریەکی بێ سنورمان لە چۆنێتی دروستبونی ئەم بونەوەرەدا بۆ دەرئەخات ئەوەیە... ئاتۆم کە

بچوکترین پارچەیە لەم بونەوەرەدا هەر بەو یاسا ناوازەیە هەڵئەسوڕیٚ کە کۆمەڵەی خۆری پیٚ هەڵئەسوڕیٚ [41].

وە زاناکان ئەڵیٚن ئەگەر قەوارەی ئاتۆمیٚك ئەوەندە گەورە بکەین هەتا بە ئەندازەی کۆمەڵەی خۆری لیٚ دیٚ، سەیر ئەکەین ماوەی نیٚوان ئەلیکترۆن بۆ ناوك (ئاتۆمیٚکی هایدرۆجین)دا ئەبیٚتە ماوەی ملیۆن میل کە ئەمەیش ماوەی نیٚوان زەوی و خۆرە [42].

ئیٚستا با بیٚینە سەر ئەوەی بزانین ئەم بونەوەرە چۆن دروستبووە... ؟ بابزانین ئەم تابلۆ رەنگینە چۆن کیٚشراوە.

وەکو لە پیٚشەوە وتمان ئەم بونەوەرە (ماددی یە) لە ئاتۆم پیٚك هاتووەو ئاتۆم بناغەی بونەوەرە، بەلاٚم زۆر و کەمی (پرۆتۆن و ئەلیکترۆن و نیوترۆن) لە ئاتۆمدا مەتەڵی سەرسوڕهیٚنەری چۆنیٚتی دروستبونی ئەم بونەوەرەن هەر ئاتۆمیٚك بە پیٚی زۆرو کەمی ئەم سیٚ پارچەیە ئاتۆمەکە لە دۆخیٚکەوە ئەگۆڕیٚت بۆ دۆخیٚکی تر.

ئاسانترین ئاتۆم لە بونەوەردا ئاتۆمی (هایدرۆجین - H)ە، چونکە ناوکەکەی تەنیا یەك پرۆتۆن و خولگەکەی دەرەوەیشی تاقە ئەلیکترۆنیٚکی تیٚدایە، پاش هایدرۆجین (هیلیۆم - He)

---

[41] الاسلام يتحدى ص٥٩ .

[42] الطب محراب للايمان ، الجزء الاول ، ص٢٧ .

کە ئەویش دوو پرۆتۆن و دوو ئەلیکترۆنی هەیە، پاش هیلیۆم (لیتیۆم = Li) ە کە سێ پرۆتۆنی هەیە.... هتد.... بەم شێوەیە ئەڕوات هەتا هەر (١٠٣) توخمەکەی ئەم بونەوەرە فراوانە (صُنۡعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِيٓ أَتۡقَنَ كُلَّ شَيۡءٍ) (النمل / ٨٨) بۆ نمونە (ئۆکسجین $O_8$) هەشت ئەلیکترۆن و هەشت پرۆتۆنی هەیە. وە ئاسن ( $_{26}Fe$) ئەلیکترۆنی هەیە. ئەمە بۆ ژمارەی ئەلیکترۆن و پرۆتۆنەکانی نێو ئاتۆم بەلاّم بۆ کێشی ئاتۆم وەکو لە پێشەوە وتمان کێشی ئاتۆمەکە ئەگۆڕێت بەپێی ژمارەی پرۆتۆن و نیوترۆنەکە بۆ نمونە کێشی ئاتۆمی هایدرۆجین (١) [٤٣] ە، چونکە تاقە پرۆتۆنێکی تێدایە، بەلاّم هیلیۆم کێشی ئاتۆمەکەی (٤)ە، چونکە دوو پرۆتۆن و دوو نیوترۆنی تێدایە. وە لیتیۆم (٧)ە، چونکە (٣) پرۆتۆن و (٤) نیوترۆنی تێدایە [٤٤].

هەر بەو شێوەیە هەموو ئاتۆمەکان بە پێی ژمارەی پرۆتۆن و نیوترۆن کێشی ئاتۆمەکە زۆرو کەم ئەکات (إِنَّا كُلَّ شَيۡءٍ خَلَقۡنَٰهُ بِقَدَرٖ) (القمر ٤٩) ، بەڕاستی هەتا زانیاری پێش بکەوێ و لە وردەکاری چۆنێتی دروستبونی بونەوەر وردبیینەوە زیاتر دەسەلاّتی ئەو

---

[٤٣] یان (١,٠٨)یە .

[٤٤] سەیری فەرهەنگی ( المنجد ) چاپی (٢١) ل٧٠٧ بکە .

ئەندازیارە بە دەسەڵاتەمان بۆ دەرئەکەوێ و زانیاری و ژیری زیاتر زۆرمان لێ ئەکات کڕنوشی بۆ ببەین.

ئا بەو شێوەیە بۆمان دەرکەوت زۆرو کەمی پارچەکانی ئاتۆم و قورس و سوکی ئاتۆمەکە چ دەورێکی سەیر ئەبینێ لە دروست بونی بونەوەردا هەر لە ئاتۆمی لۆرانسیۆم (Lw ) هەموو توخمە جۆراوجۆرەکانی بونەوەرمان بۆ دەرئەخەن، هەر لە شلەو گازو تەنە ڕەقەکان و کانزادی یەکان و توخمە تیشکدارەکان... هتد... بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر، ئەگەر ئاتۆمێك بهێنین و ژمارەی پرۆتۆنێکی لێ زیاد بکەین سەیر ئەکەین یەکسەر ئەو ئاتۆمە هەموو نەژادو کارکردن و دۆخێکی ئەگۆڕێت بە شێوەیەکی سەیر... بۆ نمونە توخمی نیۆن (١٠Ne) پرۆتۆن و (١٠) نیوترۆنی تێدایە و کێشە ئاتۆمیەکەی (٢٠)ە دوا بە دوای سۆدیۆم (Na) دێت کە ژمارەی پرۆتۆنەکانی (١١) پرۆتۆن و نیوترۆنەکانی (١٢) نیوترۆنە و کێشی ئاتۆمەکەی ئەکاتە (٢٣)، کەچی سەیر ئەکەیت بەو تاقە پرۆتۆنە جیاوازە، یەکەمجار گازێکی سستەو دوهەمجار کانزایەکی چالاکە !!. کێ ئەم جیاوازیە گەورەیەی دروست کرد ؟ کە شتێکی زۆر گرنگ ڕووی نەداوە، تەنیا ئەوەندە نەبێ تاقە پرۆتینێك و دوو نیوترۆنی

چۆتە سەر ! بێ گومان زانیاری تازە کلیلی دەرگای ئەم مەتەڵەی پێ نیە.

بۆ ئەوەی زیاتر مەبەستەکەمان بگەین و ژمارەی پرۆتۆنەکان و کێشی هەموو ئاتۆمەکان بزانین، وا لە خوارەوە ئەو نەخشەی زانای کیمیاوی بەناوبانگی ڕووسی (مەندلێڤ) کێشاویەتی ئێمەیش دایئەنێین.

خشتەی(توخمەکان) یان (خشتەی مەندلێڤ):

تێبینی:

١. ژمارەکانی سەرەوەی یاساکە ژمارەی پرۆتۆنەکانی نێو ئاتۆمن و ژمارەی ژێرەوەیش کێشی ئاتۆمەکە پیشان ئەدات.

٢. لە کتێبی (الطب محراب الایمان / د. خالص الضلبي) ل٣٤ وەرگیراوە.

جا هەر وەکو زۆرو کەمی ئەو پارچانەی نێو ئاتۆم کارێکی گەورە ئەکەنە سەر چۆنێتی دروستبونی بونەوەر هەروا چۆنێتی

تێکەڵکردنی ئەو توخمانەیش چۆنێتی دروستکردنی ڕواڵەتی بونەوەر دروست ئەکەن ... بۆ نمونە ئەگەر دوو ئاتۆم هایدرۆجین لەگەڵ یەك ئاتۆم ئۆکسجین تێکەڵ بکەین ئەو ئاوەی لێ دەرئەچێت کە یەکێکە لەهۆی سەرەکی دروستبون و مانەوەمان لەم سەر زەویەدا ﴿وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٠﴾ ؟...﴾ (الانبیاء). هەر لەبەر ئەو چۆنێتی دروستبونی ئاوە کە زانایانی کیمیاوی نیشانەی ( $H_2O$)یان بۆ داناوە.

ئیتر هەر بەو شێوەیە چی ماددەیەکمان بەرچاو بکەوێت، لە ئەنجامی چۆنێتی تێکەڵکردنی ئەم توخمانەوە دروستکراون...

| 1 | 2 | 3 | 4 | 5 | 6 | 7 | 8 | 9 | 10 | 11 | 12 | 13 | 14 | 15 | 16 | 17 | 18 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 1 H 1.008 | | | | | | | | | | | | | | | | | 2 He 4.0026 |
| 3 Li 6.94 | 4 Be 9.0122 | | | | | | | | | | | 5 B 10.81 | 6 C 12.011 | 7 N 14.007 | 8 O 15.999 | 9 F 18.998 | 10 Ne 20.180 |
| 11 Na 22.990 | 12 Mg 24.305 | | | | | | | | | | | 13 Al 26.982 | 14 Si 28.085 | 15 P 30.974 | 16 S 32.06 | 17 Cl 35.45 | 18 Ar 39.948 |
| 19 K 39.098 | 20 Ca 40.078 | 21 Sc 44.956 | 22 Ti 47.867 | 23 V 50.942 | 24 Cr 51.996 | 25 Mn 54.938 | 26 Fe 55.845 | 27 Co 58.933 | 28 Ni 58.693 | 29 Cu 63.546 | 30 Zn 65.38 | 31 Ga 69.723 | 32 Ge 72.630 | 33 As 74.922 | 34 Se 78.97 | 35 Br 79.904 | 36 Kr 83.798 |
| 37 Rb 85.468 | 38 Sr 87.62 | 39 Y 88.906 | 40 Zr 91.224 | 41 Nb 92.906 | 42 Mo 95.95 | 43 Tc (98) | 44 Ru 101.07 | 45 Rh 102.91 | 46 Pd 106.42 | 47 Ag 107.87 | 48 Cd 112.41 | 49 In 114.82 | 50 Sn 118.71 | 51 Sb 121.76 | 52 Te 127.60 | 53 I 126.90 | 54 Xe 131.29 |
| 55 Cs 132.91 | 56 Ba 137.33 | 57-71 * | 72 Hf 178.49 | 73 Ta 180.95 | 74 W 183.84 | 75 Re 186.21 | 76 Os 190.23 | 77 Ir 192.22 | 78 Pt 195.08 | 79 Au 196.97 | 80 Hg 200.59 | 81 Tl 204.38 | 82 Pb 207.2 | 83 Bi 208.98 | 84 Po (209) | 85 At (210) | 86 Rn (222) |
| 87 Fr (223) | 88 Ra (226) | 89-103 # | 104 Rf (265) | 105 Db (268) | 106 Sg (271) | 107 Bh (270) | 108 Hs (277) | 109 Mt (276) | 110 Ds (281) | 111 Rg (280) | 112 Cn (285) | 113 Uut (284) | 114 Fl (289) | 115 Uup (288) | 116 Lv (293) | 117 Uus (294) | 118 Uuo (294) |

| Series | | | | | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| * Lanthanide series | 57 La 138.91 | 58 Ce 140.12 | 59 Pr 140.91 | 60 Nd 144.24 | 61 Pm (145) | 62 Sm 150.36 | 63 Eu 151.96 | 64 Gd 157.25 | 65 Tb 158.93 | 66 Dy 162.50 | 67 Ho 164.93 | 68 Er 167.26 | 69 Tm 168.93 | 70 Yb 173.05 | 71 Lu 174.97 |
| # Actinide series | 89 Ac (227) | 90 Th 232.04 | 91 Pa 231.04 | 92 U 238.03 | 93 Np (237) | 94 Pu (244) | 95 Am (243) | 96 Cm (247) | 97 Bk (247) | 98 Cf (251) | 99 Es (252) | 100 Fm (257) | 101 Md (258) | 102 No (259) | 103 Lr (262) |

بەڵام چەندێتی و چۆنێتی تێکەڵ کردنی ئەم توخمانە دەوری سەرەکی چۆنێتی ئەو ماددانە ئەبینن.
وا چەند نمونەیەکی سەیرو سەرسوڕهێنەر ئەهێنمەوە:
ئەڵێم سەیر چونکە:
ـ ئۆکسجین: گازێکی بێ تام و بێ بۆن و بێ ڕەنگەو هۆی سەرەکی مانەوەی ژیانی هەموو زیندەوەرێکە.
. نایترۆجین: ئەویش گازێکی بێ تام و بێ بۆن و بێ ڕەنگەو یارمەتیەکی زۆرمان ئەدا لە ڕۆژانەی ژیانمانداو لەگەڵ هەناسەدا قووتی ئەدەین.
. هایدرۆجین: گازێکی بێ تام و بێ ڕەنگ و بێ بۆنە و لەگەڵ ئۆکسجین تێکەڵاوی ئەکەین (ئاو)مان بۆ دروست ئەکەن.
ئەم گازانەی کە ڕۆژی بە ملیاران ئاتۆمیان لێ هەڵئەمژین و ئەیخۆین، کەچی ئەگەر ئاتۆمێك هایدرۆجین و ئاتۆمێك نایترۆجین لەگەڵ سێ ئاتۆم ئۆکسجین تێکەڵاویان بکەین... ئایا ئەزانین چی دەرئەچێت..؟ ئەو (تێزابە) دەرئەچێت کە هیچ شتێکمان بەرگەی ناگرێت و ئەیسوتێنێ... بۆیە زاناکانی کیمیاوی نیشانەی ($HNO_٣$)یان بۆ (تێزاب)ی ڕووت داناوە. یان ئەگەر (سۆدیۆم) لەگەڵ (کلۆر) کەژەهرێکی کوشندەیە تێکەڵاوی

بکەین ئەو (خوێ) یە دەرئەچێت کە تامی چێشتمان بۆ خۆش ئەکات و ئەگەر نەیخۆین تووشی چەندان نەخۆشی ئەبین.

ئیتر هەر بەو شێوەیە ئەم دیمەنە جوانەی بونەوەر پێك هاتووە لە چۆنێتی تێکەڵاوبون و یەککگرتنی ئەم توخمانە و بە تەرازوویەکی زۆر وردی خواکرد کێشراون و بەپێی زانیاریەکی بێ سنوری خوایەتی تێکەڵ کراون و ئەم بونەوەرەیان لێ دروست بووە.

لەم باسەی پێشووماندا تەنیا باسی بناغەی بونەوەرمان کرد کە (ئاتۆم) بوو، خۆ ئەگەر باسێکی تێرو تەسەلی بونەوەر بنوسرێت، نەبە کتێبێکی واو نەبە گەورەتر لەمەو نەبە دەیان کتێبی وایش تەواو نابێ، بەلاّم ئەم باسە وەکو بەرکولێك و سەرەتایەك بەسە، بەلاّم بۆ چۆنێتی پێك هێنانی ژیان و باسم نەکرد بەڵکو بە پشتیوانی خوای گەورە بتوانم لە کتێبی (داروین لە تەرازووی ژێریدا) لەبارەی ژیان و گیان و خانەو سایتۆپلازم و پرۆتۆپلازم و... هتد... باس بکەم.

ئا بەو جۆرە کەمێك لە بناغەی چۆنێتی دروستبونی بونەوەر گەیشتین و بۆمان دەرکەوت کە هەموو پارچەیەك هەموو مولیکیوڵێك، هەموو گەردیلەیەك لەم بونەوەرە پەنجە بۆ خوای

باڵادەست و توانا ڕائەکێشێ و پەروەردگارە بێ هاوتاکەمان پیشان ئەدات.

(وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ) (الاسراء ٤٤).

## بەشی سێهەم: نە ئایدیالیزم و نە ماتریالیزم :

جاران کە منداڵ بوین لە گەڕەکدا شایی ئەکرا پیاوان دەستیان ئەگرت بۆ هەڵپەرکێ و ئێمەیش لە سەر پەڕی شاییەکەوە دەستی – گاوانی – یەکەمان ئەگرت و لەوشکی ئەمانکوتا... بێ ئەوەی بزانین هەڵپەڕکێ بکەین یان بزانین شایی کێیە.. ؟ زۆر جار ئەبوو ئەو خاوەن شاییە تینو بوو بە کاسەی سەری باوکی هەندێکمان، کەچی ئەو منداڵە هەقی ئەوەی نەبوو، هەر هەڵیئەخستەوە، زۆر جاریش ئەبوو بە ئەندامێکی شایی یەکە وەرنەئەگیراین و بە ناشرینی – بێ ئەدەب ئەبون لە خزمەتماندا و – دەریان ئەکردین.

بەڕاستی زۆربەی گەنجەکانمان و تەنانەت هەندێ لە نوسەرەکانیشمان وەکو بەزمی شاییەکەی ئێمەیان لێ قەوماوە...
هەر ئەوەندە ئەزانن دەست ئەگرن ئیتر نازانن شایی کێیە..؟
وە خۆیان هەڵواسیوە بەم و بەودا، بێ ئەوەی بیرێك بکەنەوە، جا هەر هۆی ئەم خۆهەڵواسینەیە هەموو ژیانمان بە تەرازووی ئەوان ئەکێشن و بە مەنی ئەوان ئەیپێون، خۆ ئەگەر بڵێن (خەیار بە مەتر بفرۆشن) یەکسەر گەردەن کەچن و هەوڵی تاشینی بەڵگەیش ئەدەن بۆ ڕاستی فەرمودە (زانیارییە)کەیان !!.

پاش ئەو ڕۆژە ڕەشەی بەسەر ئەورووپادا هاتوو کڵێسەو پیاوانی کڵێسە خۆیان سەپاندبوو بەسەر گەلداو بووبونە گەورەترین کۆسپ لە ڕێی پێشکەوتنی زانیاریداو خۆیان کردبووە جێداری خواو بە مەترە دووجا بەهەشتیان ئەفرۆشت... وە بیردۆزی یە ئایدیالیەکانی ئەرەستۆو سوکرات و ئیفلاتونیان کردبووە فەرموودەی خواو بڕیاریان دابوو هەرکەسە لەو تیۆریە میسالیانە دەرچێت لە ئاین دەرچووەو ئەبێ سزای سەختی خۆی بچێژێ، تەنوریان داخست بۆ سوتاندنی هەرکەسە بڵێ زەوی خڕە یان بڵێ باران لە هەڵم ئەباریێ یان بڵێ ماسیەکەی ژێر زەوی درۆیە... هتد... دەیانی وەك (بڕۆنۆ) سوتێنراو سەدانی وەك (گالیلۆ) بەندکراو هەزارانی تر بێ سەرو شوێن لە ژێر دەستی چەپەڵی (مەحکەمەی تەفتیش)دا سەرنگوم بون.

ئالەم کاتەدا، تەقینەوەیەکی گەورە قەوماو پیاوانی زانیاری شۆڕشێکی پیرۆزیان کرد بەسەر دام و دەزگای - کڵێسە. دا... بەم شۆڕشە هەموو ڕواڵەتێکی ژیان گۆڕا... هەموو بیرکردنەوەیەك و هەموو بیرەوەریەك دوو ڕواڵەتی وەرگرت.. کۆن و نوێ.. کۆن و نوێ لە هەموو شتێکدا لە ئەدەب... فەلسەفە... بیروباوەڕ... ڕەوشت.. تەنانەت ئاینیش... هتد.

بۆیـە فەلـسەفەو تیۆرەکـانی ئـەم زانیاریـە لـەم کاتـەدا زیـاتر لەهـەموو کاتێـك لـە یـەکتری جیابونـەوە و ئاگرەکـەیان خـۆش کرد... یەکەمیان خۆی بەستەوە بەدیار ماددەوە و ئەو ماددانەی بەرچاوی ئەکەوێت و خۆی ناو نا (ماددی یـەت - ماتریـالیزم) و ئەوی تر خۆی ناونا (نمونایەتی - میسالیەت - ئایدیالیزم)

لێرەدا پێویـستمان بەڕوونکردنەوەی سەرچاوەکانی ئەم دوو ڕێبـازەو پاڵـەوانانی سـەر شـانۆکانیان نیـە... بـەڵام پیـاوانی زانیاری ئەو سەردەمە چونکە ئەو هەموو هەڵوێستە نالەبارەیان لە پیاوانی ئاینی (فەلە) دیبوو بەرامبەر بە زانیاری زاناکان، ئیتر وایـان ئـەزانی هـەموو ئاینێـك هـەر وایـە.. بۆیـە لـە خۆیانـەوە بڕیاریاندا کە هەموو ئاینێك میسالی یەو لە جیهانی ئەنێشەوە هاتووە.

ئەم بیرە هەڵەیە بەو شێوەیە تاماوەیەکی زۆر مایەوە، بەڵام چەندە هەور بەری هەتاو بگرێ ئەو هەر تیشکی خۆی ئەهاوێ و هـەر کەسـە کـوێر نـەبێ لێـی ون نـابێ.. وە ئێـستا بـە دەگمـەن پایتـەختی وڵاتـانی ئـەورووپا هەیـە بنکـەی بانگـەوازی ئیـسلامی تێدا نەبێ و گۆڤارو ڕۆژنامـەو چاپەمەنی ئیسلامی ئەگەیەنن بە

هەموو ئەوروپادا... وە ئەوانەی ئەمڕۆ موسڵمان ئەبن لە چینی ڕۆشنبیرە هەرە بەرزەکانن [45].

بریا ئەو بنکانە لە هەندێ ولاتی تریش هەبوایە، ئەو کاتە ئەماندی کە زۆر بیروباوەڕ شەنگە شرەی خۆیان بەرەو ولاتی نەمان ئەپێچێتەوە.. بەلاّم لاوەکانی ئێمە چونکە

تازە خەریکن فێری گرۆگاڵ ئەبن و نوسینەکانی ئەو سەردەمەی ئەوروپا ئەخوێننەوەو هیچیش لە ئیسلام نازانن هەر بەو تەرازووە کۆنە ئایینی پیرۆزی ئیسلامیش ئەکێشن و لایان وایە لەم سەر زەویەدا تەنیا ئەبێ دوو جۆرە فەلسەفە هەبێ، میسالی و ماددی، ئەبێ دوو جۆرە ڕژێمی ئابووری هەبێ، سۆشیالیستی و سەرمایەداری... هتد، هەر بەو تەرازووە ئاینی پیرۆزی ئیسلام و پیاوانی ئیسلامیش ئەکێشن...

با چەند نمونەیەکتان لەو چەند کێشانە نا بەجێیەتان بۆ بهێنمەوە ئەوجا دێمە سەر ئەوەی کە ئایا ڕاستە ئیسلام میسالی یەو ڕێبازێکی ئایدیالی گرتووە ؟.

---

[45] سەیری کتێبی ( رجال و نساء اسلموا ، عرفات كامل العشي ) و کتێبی ( لەسەرە ڕێی کاروانی باوەڕدا بەشی سێهەم ) نووسینی نوسەری لاو ( صلاح الدين ) بکە . .

ماموّستا (ممتاز حیدری) له کتێبی (مه‌لای گه‌وره ل ٥٧) له‌ژێر سه‌ردێڕی (به‌رپه‌رچ دانه‌وه‌ی فه‌لسه‌فه‌ی کۆنه‌په‌رستی) دا که ئه‌یه‌وێ – به‌لای خۆیه‌وه . ستایشی مه‌لای گه‌وره بکات و ئه‌ڵێ (مه‌سه‌له‌ی تێگه‌یشتن له فه‌لسه‌فه و شوێن و ده‌وری مرۆڤ له گۆڕینی دنیادا چییه...؟مه‌سه‌له‌یه‌کی یه‌کجار ئاڵۆزو گرنگه، له سه‌دان ساڵ له‌مه‌وبه‌روه مرۆڤ له کێشه‌دا بووه بۆ ساغ کردنه‌وه‌ی، تا به شێوه‌یه‌کی زانستیانه و به‌ر له (١٥٠) ساڵ ئه‌مه ساغ نیشانکردنی هه‌یه، واته زاناکان بون به دوو به‌شه‌وه:

یه‌که‌میان: بڕوای به (مادده‌یه‌ت) هێناو ئه‌وی تریشیان به (میسالیه‌ت)، بێ گومان مادده‌یه‌تی زانستی (زانستی !) شوێن و ده‌وری مرۆڤ ده‌ستنیشان ده‌کات و میسالیه‌تیش به پێچه‌وانه‌ی زانست له‌سه‌ر بنچینه‌یه‌کی پوچه‌ڵ و بۆش ئه‌و شوێنه دووره بۆ مرۆڤ دیاری ده‌کات.

مه‌لای گه‌وره‌یش به پێچه‌وانه‌ی ئه‌وه که‌له بنه‌ماڵه‌یێکی ئاینی بووه، وه‌ك بڵێی یه‌کێك بووه له‌و زانایانه‌ و ئاگاداری ئه‌و کێشه‌یه بووه و هه‌ڵوێستی خۆی له‌سه‌ر ڕۆشنایی – مادده‌یه‌ت – ده‌ستنیشانکردووه[٤٦] ....) ئه‌مه وا، که‌چی هه‌ر ئه‌و

---

[٤٦] لێره‌دا یان ئه‌بێ مه‌لای گه‌وره ( هه‌مه‌ڕه‌نگ ) بووبێ که ماددی بووه – وه‌کو حیدری ئه‌فه‌رمێ – که‌چی ڕیش و مێزه‌رو هێمای ئیسلامی هه‌ڵگرتووه – وه‌کو

ماموستایەو لەهەمان کتێب (ل٦٠)دا ئەڵێ (مەلای گەورە زانایەکی پێشکەوتن خوازی کۆمەلایەتی و شاعیرێکی نیشتمان پەروەری کورد بووە، له زانایی و چاکەخوازی ئاینییدا پەیڕەوی زانای ئاینی بەناوبانگ (جەمال الدین ئەفغانی) کردووە و هاوتای (شێخ محمد عبده)ی میسری و (عبدالرحمنی کواکبی بووە) [٤٧] ئەمە نەك تەنیا ماموستا ممتاز حیدری وای نوسیبێ، بەڵکو زۆربەی نوسەرانی ئەمڕۆمان کە لە فەلسەفە ئەدوون یەکسەر ئەڵێن فەلسەفە یان ماددی یەت یان میسالی [٤٨].

---

لەو وێنەی سەر هەمان لاپەڕەی کتێبەکەی دەردەکەوێت – و بەرنوێژی بۆ خەڵکی کردووە و ڕاڤەی قورئانی پیرۆزی لێك داوەتەوە ... یان ئەبێ مەلای گەورە ڕێبازێکی گرتبێ ، نە ماموستا ممتاز حیدری و نەماموستا کریم شارەزا ، شارەزای نەبن ... کە دووهەم وتە ڕاستترە ... مەلای گەورە پێشەوایەکی تێگەیشتوو له ئیسلام و شۆڕشگێڕێکی بیرەوەری ئیسلامی بووە جێگای شانازی هەموو ئیسلامخوازێکە .

[٤٧] بەلأم نازانم چۆن ماموستایەك هاوڕێبازی ( جمال الدینی ئەفغانی ) بێ ماددی ئەبێ ... ؟ خۆزگە ئەمزانی ئایا ماموستا حیدری کتێبی ( الرد علی الدهرین )ی ئەفغانی خوێندوەتەوە ... ؟

[٤٨] سەیری کتێبی ( نەزەریەی نسبی و خرۆکی گەردوون )ی ماموستا عمر تۆفیق ل٥ و ل٦ بکە .

خۆ ئەگەر یەکێك لەسەر بیروباوەڕە پیرۆزەکەی ئیسلام بنوسێت، وا ئەزانن کارگوزاری ئایدیالیزمی کردووە و ئەڵێن (کێشەی هەزار ساڵەی ئایدیالیزم و ماتریالیزم دەبڕێتەوە) [49]
هۆیەکەیش ئەوەیە چونکە ئەوان خۆیان بە تەرازووی بێگانە شت ئەکێشن وا ئەزانن هەموو کەس هەروایە... تەنانەت هەندێ جار وشەی کوردی هەزار ساڵەمان ئەخەنە ئەو تەرازووەوەو مۆری بێگانەی لێ ئەدەن وەکو (دەروێشایەتی) کرا بە (سۆفیزم) [50]. با ئەمانە هەریەکەیان لە جێگای خۆیاندا بن و بڕۆینەوە بۆ سەروکاری (ئایدیالیزم و ماتریالیزم)ە کەمان و بزانین ئایا ڕاستە کە ئیسلام بریتی لە یاسایەکی ئایدیالی و لە جیهانی ئەندێشەدا هەڵقولاوە و میسالی یەکی ڕووتە ؟

پێشەکی با لە مانای ڕاستەقینەی (میسالیەت = ئایدیالیزم) بگەین و ئەوجا دێینە سەر میسالێتی ئیسلام، (مثالي) بە پێی بەکارهێنانی زاراوەی فەلسەفەی ئەمڕۆمان – بەو کۆمەڵە یاساو بیروباوەڕو بیرەوەری یە ئەوترێ کە لە جیهانی ئەندێشەدا داڕێژراو بێ و خەڵکی بۆ هان بدرێ، بەڵام لە توانای مرۆڤدا

---

[49] ڕۆژنامەی ( بیری نوێ ) ژمارە ۲۱۹ ڕۆژی ٤-۱۲-۱۹۷٦ .

[50] مامۆستا محمود زامدار لە گۆڤاری ( ڕۆشنبیری نوێ ) ژمارە ( ۳٦ ) ڕۆژی ۱۹۷٤/۱۲/۱ ل۱۰ دا کە باسی مەولانا خالدی نەقشبەندی ئەکات .

نەبێ پراکتیك (تطبیق)ی بكات. جا بەپێی ئەم پێناسە كە بۆ میسالی یەت دانراوە بزانین ئایا ڕاستە ئیسلام میسالیە..؟ بزانین ئایا ئەو بیروباوەڕەی ئیسلام هێناویەتی لە وزەی ئادەمیزاددا نییە جێ بەجێی بكات..؟ چونكە لەسەر بناغەیەكی خەیاڵاوی و ئەندێشەدا دامەزراوە..؟ خۆ ئەگەر كرابێت تا ئێستا كراوە... ؟

یاسای میسالی دووجۆرە:

١. ئایدیالی یاسا (میثالیة النظام).

٢. ئایدیالی جێبەجێ كردن (میثالیة التطبیق).

جۆری یەكەم هەرگیز جێبەجێ ناكرێت چەندە كۆمەڵی ئادەمیزادان بگۆڕێن و چەندان دۆخیان بەسەردا تێبپەڕێت، بەڵام جۆری دووهەم یاسای بیروباوەڕە كە ئایدیالی نیە بەڵكو ئەو كۆمەڵەی ئەو كاتە ناتوانن جێبەجێی بكەن، بەڵام كاتێك كۆمەڵێك بە پێی ئەو نەخشەیە پەروەردە كران ئەوكاتە زۆر بە ئاسانی ئەتوانرێ جێبەجێ بكرێ و بگوێزرێتەوە بۆ جیهانی (واقیع)... جا با بزانین ئیسلام لە كام بەشەیە، ئایا میسالیەكی ڕووتە ؟ یان بەپێی باری نا موسڵمان – بەناو موسڵمان –ی ئەمڕۆمان میسالیە.

پێویستە بزانین بەپێی ڕێبازی مێژوو (هەرچی یاسایەك تاقە جارێك لە مێژووی ئادەمیزاددا جێبەجێ هێنرا یەكسەر ئەو

ڕێبازە لە جیهانی میسالیەوە ئەگوێزرێتەوە بۆ جیهانی (واقع) و ئیتر ناونابرێت بە میسالی... چونکە ئەوەی ئادەمیزاد توانی لە قۆناغێك لە قۆناغەکانی مێژوویدا جێبەجێی بکات.،. هەرکاتێ دەستی بداتێ بە ئاسانتر لە جارێ پێشوو ئەتوانێ جێبەجێی بکات چونکە مرۆڤ هەر مرۆڤە لەهەر چەپ و شوێنێکدا هەبن).. خۆ ئەگەر سەیری مێژووی ئیسلام بکەین بۆمان دەرئەکەوێ هیچ یاسا و بەند و ڕژێم و تیۆرێکی ئیسلام نیە لەکاتی خۆیدا جێبەجێ نەکرابێت... دوا تیۆری هاتۆتە جیهانی (واقع) و بڵێین ئیسلام میسالیە.. ؟ ئەگەر توتی ئاسا بڕیار نەدەین کام ویژدان ڕێمان ئەدات بڵێین ئیسلام ئایدیالیزمییە.. ! ؟

ڕەنگە هەندێك بڵێن ئەوکاتە پێغەمبەر (درودی خوای لێبێت) و هاوڕێکانی توانیان ئەو ڕێبازە پیرۆزە لە جیهانی ئەندێشەوە بهێننە جیهانی (واقع)، خۆ ئێستا نەپێغەمبەر هەیە و نە عومەری کوڕی خەتتاب و نە عومەری کوڕی عبدالعزیز و نە.. نە.. هتد...

ئەم بەڵگەیە نابێتەهۆی میسالیەتی ئیسلام چونکە پاش ئەو هەموو پەندو ئامۆژگاری و دەرسەی لە مێژووی دووڕو درێژی ئیسلام وەرگیراوە، ئەوانە ئەبنە هۆی ئاسانی جێبەجێکردنی

یاساکانی ئیسلام ئاسانتر لە کاتی هاوڕێکانی پێغەمبەر (درودی خوای لێبێت).

بۆ نموونە ئێستا کە لە وڵاتە ئیسلامییەکان سەرەك کۆمارەکانیان خانەنشین (تقاعد) ئەکەن و سەرەك کۆماری تازە بۆ خۆیان هەڵئەبژێرن... ئەم هەڵبژاردنە لە کاتی (أبوبکر و عمر) دا دەسەوسان (معجزە) بووە، بەڵام ئێستا زۆر بە ئاسانتر لەو کاتە جێ بەجێ ئەکرێت...

ئەوەندە هەیە ئەگەر بە ناوی بەریتانیاو ئەمریکاو.. و... وە داوا بکرێت داوایەکی (تقدمی) یە بەڵام ئەگەر بەناوی ئیسلامەوە داوا بکرێ داوایەکی (میسالی و رجعی) یە، کە ئەوانیش لە ئیسلامەوە فێربون[51] ...

هیچ پێویستیمان بە خودی پێغەمبەر (درودی خوای لێبێت) نییە، چونکە ئەگەر پێویست بوایە خوا نەیئەمراند هەروەها پێویستیمان نە بە عومەری کوڕی خەتتاب و نە بە هیچ هاوڕێیەکی تری پێغەمبەر هەیە... ئەو بەرنامەو ئەو بیروباوەڕە توانی عومەر دروست بکات ئەتوانێت سەدان عومەری تر دروست بکات، چونکە کاتێ عومەر هەنگاوێکی مێژووی و دەستەوسانی ئەنا، لە بن دەستی خۆی دەری نە ئەهێنا بەڵکو

---

[51] شبهات حول الاسلام ص ١٨٦ .

هەر لەو قورئانە دەری ئەهێنا کە ئەمڕۆ ئێمە کردوومانە بە یاسەوانی بێستان و نوشتەی هاڵ و شەوەی پێ ئەنوسین...
کاتێك (عومەر) (ڕەزای خوای لێبێت ) ئەیفەرموو (ئیمام [52] ئەتوانێ هەر سامانێکی دەوڵەمەندەکان لە پێویستی ژیانیان زیاتر بوو، بەزۆر لێیان بسێنێ و بیدات بە هەژارانی وڵات [53])ئەمڕۆ ئێمە ئەتوانین جێبەجێی بکەین بە مانای بەندێکی سەرەکی (یاسای ئابووری ئیسلامی) نەك لەبەر خاتری عومەر چونکە عومەر لە خۆیەوە نەیفەرمووە بەڵکو لە دەقی ئایەتی (كَىۡ لَا يَكُونَ دُولَةَۢ بَيۡنَ ٱلۡأَغۡنِيَآءِ مِنكُمۡ ) (الحشر / ٧) دەریهێناوە.

کەواتە ئاینی پیرۆزی ئیسلام یاسایەکی ئایدیالی و هەڵقولاوی جیهانی ئەندێشە نیە بەڵکو بۆ پێویستی کۆمەڵانی ئادەمیزادان هاتۆتە خوارەوەو ئادەمیزادیش دڵنیایی و تام و مەزەی بەختیاری ناچێژێ لەژێر سایەی ئەم یاسا ناوازەیەدا نەبێ. لە ڕاستیدا ئەوانەی بە تەمان هەموو سەر زەوی بخەنە ژێر یەك یاساوەو هەر ئەندامێکی ئادەمیزاد بەرژەوەندی ئەو مرۆڤەکەی تری لە هی خۆی زیاتر بوێ نەك بە هەستێکی دەروونی و ناوخۆیی بەڵکو لە ژێر پاڵەپەستۆی (هێزێکی

[52] ئیمام واتە سەرۆکی دەوڵەتی موسڵمان : نەك پێشنوێژی ئەوقاف .
[53] شبهات حول الاسلام بەشی الأیسلام و المثالية ل١٨٧ .

دیکتاتۆریـــشدا) ئەوانــە ئایــدیالی و میــسالین و لــە جیهــانی ئەندێشەدا هەڵەخەنەوە.

دیسان ڕەنگە هەندێکی تـر بڵێن ئیسلام تـەنیا لـە فەلسەفەدا ئایدیالیــەو لــە یاســاکانی تریــدا (واقیعــی) یــە. ئیــسلام لــە فەلسەفەیــشدا ئایــدیالی نیــەو بــەڵکو ئیــسلام ئیــسلامە، نــە ئایدیالیزمەو نە ماتریالیزم، نە سەرمایەداریەو نـە کۆمۆنیستی نــە ڕۆژهەلاّتیــەو نــە ڕۆژئــاوایی ( وَكَذَلِكَ جَعَلْنَكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ ) (البقرة / ١٤٣) [٥٤].

تەنانەت لەو شەڕە ووتەیەی نێوان ئایدیالیزم و ماتریالیزم کە بــەناوی فەلــسەفەوە ئەیکــەن، ســەیر ئەکــەین ئیــسلام خــۆی لەگەڵیان تێکەڵ ناکات و زۆر بە ئاسانی وەلاّمـی ئەو پرسیارەی لەوان بووە بە مەتەڵی ژیان ئەداتەوە... بۆ نمونە:

... دروسـت بـونی مـاددە لـە پـێش بیروباوەڕیـدا بـوە یـان بە پێچەوانەوە کێشەیەکی سەرەکی نێوان فەیلەسوفەکانی ئایـدیالی و ماتریالیـە، ئایدیالیـەکان ئـەڵێن خـوا ژیـری یەکـەمی دروسـت کردووە و ژیری یەکەم ژیری دووهـەمی دروسـت کـردووەو ژیـری دووهەم ژیری سێهەمی دروسـت کـردووە هـەتا ژیـری دەهـەم. کـە

[٥٤] سەیری مانای ئەم ئایەتە پیرۆزە لە تەفسیری خاڵ جزمی دووهەم ل ٥ دا بکە

هەر ژیریەك ناو ئەنێن یان ئەستێرەیەکی کۆمەڵەی خۆر لەگەڵ گیاندا یان پارچەیەکی پتەوی بونەوەر لەگەڵ گیانتدا [55].

وەکو – پەنا بە خوا – خوا خۆی نەتوانێت پارچەکانی تری بونەوەر دروست بکات پێویستی بە یارمەتی ژیری یەکەم و دووهەمی دەستکردی ئایدیالیەکان هەبێت، ئەو شیتەڵ کردنەوە ئایدیالیە ژیری دەبێتە دروستکەری ماددەکان و گیان... هەر بەو شێوەیە کە ئەڵێن بیرەوەری لە پێش ماددەوە بووە.

وە ماددییەکانیش ئەڵێن ماددە لە پێش ژیریەوە بووەو ماددەو ژیری دوو وێنەی پێچەوانەی یەکترن و ژیری ڕواڵەتێکە لە ڕواڵەتەکانی مێشك [56]. وە ئەگەر ماددە نەبێ ژیری نابێ... بەڵکو ژیری لە ئەنجامی گەشەکردنی ماددەوە پەیدابوە [57].

بەڵام ئیسلام ئەڵێ (نە ژیری ئەتوانێ ماددە دروست بکات وە نە ماددە ئەتوانێ ژیری دروست بکات، هیچ شتێك توانای دروستکردنی هیچ شتێکی نیە خوا نەبێ، بەڵێ ژیری نە ماددەیە و نەڕواڵەتی ماددە (وەکو ماددیەکان ئەڵێن) بەڵام دروستکەری ماددەیش نیە (وەکو میسالیەکان ئەڵێن)... وە ئایا ژیری لە

---

[55] سەیری کتێبی ( یەکبوون – وحدة الوجود ) مامۆستا عمر توفیق ل٤–٧ بکە

[56] سەرچاوەی پێشوو ل٩ .

[57] الفلسفة ماركسية ( عارض و نقد ) كمال حسين ، ص٨٩ ، طبعة الأولى .

پێش ماددەوە بووە یان ماددە لە پێش ژیریەوە بووە... ؟ ئەمە پرسیارێکی ئەوەندە گرنگ نیە فەلسەفەی ئیسلام خۆی پێوە خەریك بكات. چونكە ئێمە كە بڕوامان هێنا بەوەی خوا دروستكەری هەردووكیانە، ئیتر بە لامانەوە گرنگ نیە خوا كامیانی پێش كامیان خستبێت، و لە پێش ئەویتردا دروستیكردبێ.

ئا بەم شێوەیە بۆمان دەركەوت كە ئیسلام ئایدیالی ڕووت نیە وەكو ماددیەتی ڕووت نیە وە ئەگەر نووسەرێكی ئیسلامخواز ڕێبازە شیرینەكەی ئیسلامی گەیاند بە كۆمەڵ كارگوزاری ئایدیالیزمی نەكردووە.. بەڵكو ئیسلام پەروەردە كردووە... بەڵێ ئیسلام تاقە ڕێبازەكەی ژیان و ئەو ڕێبازەی كە برایەتی لە نێوان ماددەو گیان و لاشە و دەروونندا پتەوكردووە.

**هەبونایەتی – الوجودیە ـ**

جیاوازی ئەم چەرخەی ئێستامان لەگەڵ چەرخە پێشووەكانی تر ئەوەیە لەم چەرخەدا چەند جۆر كەرەسەو پێویستی ژیان دروست ئەكرێت، بگرە ئەوەندەیش . بەناو – بیروباوەڕ دروست ئەكرێت، هەروەها چۆن هەموو ساڵێك مۆدێلی تازەی ئۆتۆمبێل و بەرگ ئەگۆڕێت، هەر بەو جۆرە هەر ماوەیەك جۆرە بیروباوەڕێك ئەخرێتە نێو قوتوو ئەنێرێ بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست

و بڵاو ئەکرێتەوە... کە ئەوەندە بیروباوەڕی هاتوو (مستورد)مان بۆ هاتووە ڕۆشنبیرەکانمان نازانن چی بخوێننەوە و شوێن کام بکەون... ؟ یان لەسەر کامیان بنوسن. ؟ یان کامیان بلاوێننەوە کامی تریان بدەنە بەر نەشتەری شیکردنەوە؟!

بەڵام لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە هەتا مرۆڤ مێشکی بەو جۆرە بیروباوڕانە بناخنێت زیاتر تینوی بیروباوەڕێکی تر ئەبێت و بە هیچیان تینوێتی ناشکێ.

لە هاوینی ساڵی ڕابردوو (١٩٧٦)دا ڕۆیشتم بۆ سلێمانی و بیستم کۆڕێك گیراوە لە کۆڕەکەدا ژیانی (سارتەر[٥٨])ی پێشەوای – وجودی –یەکان باس کراوەو لە زۆر ڕووی ئەم بیروباوەڕەوە دوابون، هەندێك لەوانەی کە تووشی پەستی هاوچەرخ بوو بون و فەلسەفەی ماددیەت بە خۆڕایی گێژو کاسی کردبون و ماندوو بووبون ، وتەکانی سارتەر بیروباوەڕەکەی سەرنجی ڕاکێشابون.

بۆیە منیش حەزم کرد بەسەر پێیەکەوە نەختێك لەو بیروباوەڕە بدوم. ئەوی من لە یەکەمین قۆناغی ئەم فەلسەفەوە بۆم دەرکەوتووە ئەوەیە کە ئەم بیروباوەڕە سەرکەوتوو نیە،

---

[٥٨] سارتەر – فەیلەسوف و نووسەری ڕەشبین ( متشائم )ی فەرەنسیەو ساڵی ١٩٠٥ لە پاریس لەدایك بووە و خاوەنی کتێبی – الوجود و العدم – و – الطريق الحرية – و ... چەند کتێبێکی ترە .

چـونکە یەکـەمین نوسـراوێکی وجـودی کـە دەسـتم دایـە خوێندنەوەی کتێبی (الوجودیة مذهب انساني) بوو کە دانـراوی (جان بۆڵ سارتەر) خۆیەتی و (د.کمال الحاج) پێشەکی گۆڕاوە عەرەبیەکەی بۆ نووسیوە... خۆ ئەگەر سەیری هۆی گۆڕین و هێنانی ئەم بیروباوەڕانە بۆ وڵاتی ئێمە بکەین.. سەیر ئەکەین هەموو هۆیەکەی تەنیا بۆ ڕووخاندنی هێزی باوەڕ بە (خوا) یە لە دڵی لاوەکانی ئەم وڵاتە ئیسلامیانەدا... کەچی (د.کمال) لە پێشەکیەکەیدا ل ٣٠ ئەڵێ (ئێمە لەگەڵ بێ باوەڕیدا ناگونجێین و سارتەر خۆی پەشیمانە لە بێ بڕواییەکەی بە خوا... وە هێمای پەشێمانی لە نێو چاوانی ئەخوێنرێتەوە) وە ئیتر (کمال الحاج) دێت بە سەر هەڵنانی ئایین و گونجاندنی لەگەڵ فەلسەفەو هتد...

لە ڕاستیدا – وجودی – فەلسەفەیەکی بەبلاّو نیە... بەڵکو چەند تیۆرێکی پرژو بلاّوە کە چەند پێشنیارێکی خۆیان تێدا دەربڕیوە لە چەند ڕوویەکی ژیانەوە... کە ئەڵێم بەر بلاّو نیە، مەبەستم ئەوەیە وەکو فەلسەفەکانی تر شیتەڵکردنەوەیەکی دیاریکراوی نیە لەسەر چۆنێتی پەیدابونی بونەوەرو ژیان، کە ئەمەیش کاری سەرەکی فەلسەفەیە. تەنیا چەند تیرێکی

هـەڵبزکاوی کـاڵ و کرچـە تەنانـەت لـە مێـشکی فەیلەسـوف و پێشەواکانی ئەم ڕێبازەیشدا [٥٩].

وجودی دوو جۆرە، وجودی خاوەن باوەڕ (مؤمن) و وجودی بـێ بـاوەڕ (ملحیـد)... وە هەریەکـەیان کۆمـەڵێك دواکـەوتوو فەیلەسوفیان هەیە وەکو (کال جاسبرز) و (مارسیل) کە خاوەنی باوەڕبون بە خوا. یان وەکو (سارتەر) کە بێ باوەڕە بەڵام کاتێ خـەڵکی بـانگ ئـەکرێن بـۆ شـوێن کـەوتنی (وجودیـەت) بـۆلای کۆمەڵی دووهەم بانگ ئەکرێن و مەبەستیان لە بێ باوەڕەکانە.

مەبەسـتی وجودیـەت یـاخی بـون و فـڕێ دانـی ڕابـردووی مێـژووەو جەنگاندنـە لەگـەڵ کەلـەپورەی هـەموو ئـەو نەتەوانـەی شوێنی ئەکەون.

وە وجودیەت تێکۆشانە – بەلای خۆیانەوە- بۆ گەڕاندنـەوەی بـونی مرۆڤایـەتی و ئـەڵێن (هـەموو تیـۆروو بیردۆزیـەکانی سەدەکانی ناوەڕاست و ئەم سەردەمە هیچیان نەیانتوانی کێشەو گـیرو گرفتـەکانی مـرۆڤ چارەسـەر بکـەن و ئـەو سەربەسـتی و بەرەڵاییەی مرۆڤ پێویستی بێت نەخراوەتە بەر دەستی [٦٠].

---

[٥٩] الوجودية و واجهات الصهيونية ، ( د.محسين عبدالحميد ) ص٣ .

[٦٠] سەرچاوەی پێشوو ل ٤ سەیر بکە .

بەڕاستی ئەوەی دەرئەکەوێت لە مەبەستی وجودی لە ئەنجامی خوێندنەوەی کتێبەکانی سارتەر [61] ئەوەیە کە (وجودی) باوەڕیان بە ڕەوشت و (قیم) نیەو بەڵکو تێئەکۆشن بۆ ئەوەی بەرەلاّییەکی بیّ سنوریان بۆ دەست بدات.

وە هەر بەهۆی ئەم یاخی بونیانەوە لە ڕەوشت و نەریتی مرۆڤایەتی سەیر ئەکەین بە سەدان لاوی کوڕو کچی فەرەنساو ئەڵمانیاو نەمساو سوید و زۆربەی ئەورروپا پەلامار ئەدەنە ئەم فەلسەفەو هەموو سنورێکی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵی پیّ ئەشکێنن.. چونکە پێی سارتەریش فەیلەسوف ڕووسی – دەستۆفیسکی گوتویە (کە خوا نەبێت هیچ شتێك قەدەغە نیە).

تەنانەت وجودیەکانم پەیوەندی تایبەتی نێوان ژن و مێرد بە پەیوەندیەکی بۆرجوازی دائەنێن و بەڵکو بەلای ئەوانەوە نابێت پیاوێك تاقە ژنێك یان ژنێك تاقە پیاوێکی هەبێت:

نوسەری بەڕێز مامۆستا (محمد شیت خطاب) لە کتێبی (الأيام الحاسمة قبل معركة المصير ص٧٠ ـ ٧١) دا ئەڵێت:

کاتیّ سارتەر لەگەڵ (سیمۆن دی بۆفوار)ی خێزانی لە ساڵی ١٩٦٧ دا سەریان دا لە میسر، لە وتو وێژێکی ڕۆژنامەگەریدا کە لە گەڵ ڕۆژنامەوانێکی میسریدا ئەکەونە گفتوگۆ، ڕۆژنامەوانە

---

[61] الفلسفة ماركسية ( عارض و نقد ) كمال حسين ، ص٨٩ ، طبعة الأولى .

میسریه‌که که له سارته‌ر ئه‌پرسێت په‌یوه‌ندی چیه له‌گه‌ڵ سیمۆن دی بوفوار .. ؟ سارته‌ر ئه‌ڵێ (ئه‌و هاوڕێ – ژن –مه به‌ڵام ڕێگه‌م ئه‌دات به سه‌ربه‌ستی له‌گه‌ڵ هه‌ر ئافره‌تێك بمه‌وێ ڕائه‌بوێرم و ئیشی ژن و مێردی له‌گه‌ڵ ئه‌که‌م.

دیسان هه‌ر ئه‌و ڕۆژنامه‌وانه له ژنه‌که‌ی سارته‌ر ئه‌پرسێت پێشنیارت چیه به‌رامبه‌ر په‌یوه‌ندی نێوان ژن و مێردایه‌تی (العلاقة زوجية..؟).

ژنه ئه‌ڵێ (ئه‌م جۆره شتانه نه‌ریتێکی بۆرجوازین و به‌ره‌و نه‌مان ئه‌ڕۆن[٦٢].

دیسان وجودی نایانه‌وێ له باره‌ی باوه‌ڕ به خواوه بکۆڵنه‌وه، چونکه ئه‌زانن دۆزینه‌وه‌ی خوا به که‌مترین لێکۆڵینه‌وه ئه‌چه‌سپێ و ژیانی به‌ره‌ڵاییان ئه‌شێوێ، سارته‌ر ئه‌ڵێ (وجودییه‌ت، فه‌لسه‌فه‌یه‌ك نیه بگه‌ڕێ به‌دوای دروستکه‌ردا بۆ بونه‌وه‌ر) [٦٣] وه ئه‌ڵێ (بونی خوا مه‌به‌ست نیه، خوا هه‌بێ یان نه‌بێ هیچ کێشه‌یه‌ك ڕوو نادات) [٦٤]، وه هه‌ڵوێستی ئیسلام به‌رامبه‌ر به

---

[٦٢] سه‌یری کتێبی ( الأنسان و داروينية )ی مامۆستا محمد صالح كريم خان ل٣٣٦ بکه .

[٦٣] الوجودية مذهب انساني ، سارته‌ر ص٨٩ .

[٦٤] سه‌رچاوه‌ی پێشوو ل ٩٠ .

فەلسەفەو هیوای پاشەڕۆژی وجودییەکان بەم شێوەیەی خوارەوەیە، وەکو لەم خاڵانەی خوارەوە بۆمان دەرئەکەوێت:

١. وجودی، لای وایە کە ئادەمیزاد سەربەستە، سەربەستێکی بێ سنور (وە ژیانی تەنیا ئەو چەند ڕۆژەیە کە تێیدا ئەژی، لەبەر ئەوە هەتا ڕابوێری و بەڕەڵابێت هێشتا هەر کەمە [٦٥] . چونکە کە مرد تازە نە ئەگەڕێتەوە بۆ ژیان وە نە زیندووبونەوەی پاشەڕۆژیشی هەیە.

ئیسلام باوەڕی بە سەربەستی مرۆڤ هەیە، بەڵام نەك سەربەستیەکی بێ سنور... چونکە:

کاتێ سەربەستییەکی بێ سنورت هەیە.. کە خۆت جێگای لەدایك بون و دایك و باوکت دیاری بکەیت.. یان خۆت شێوەی دەم و چاوو کورت و درێژی قەڵەوی و لاوازیت دیاری بکەیت... کاتێ تۆ سەربەستی تەواوی هەرچیت بوێ بتوانی بیکەیت و نەخۆشی و چەرمەسەرێی ژیان سەربەستیەکەت لێڵ نەکات.

کەواتە تۆ سەربەستی تەواوت نیە.. چونکە لای ئیسلام تۆ (خلیفە)ی خوایت لەم سەر زەویەداو ئەوەندە سەربەستیت هەیە کە دڕك بچێنی یان گەنم. تاکو ڕۆژی دروێنە چیت چاندبێ ئەوە

---

[٦٥] ابلیس ، د.مصطفی محمود ص١٢٨ . .

بدوریتـەوە.. کەواتـە پێویـستە ئـەو سەربەسـتیە لـە کـارێکی مرۆڤایەتی سوود بەخشدا بەکاربهێنی.

٢. لای وجودیەکان، مرۆڤ ڕۆژ ڕەش و (متشائم) و چارە ڕەشەو هیچ خوایەك پەروەردگارێکی نیە چاودێری بکات [٦٦].

ژیانی ئادەمیزاد هەوڵێکی بێ ئامانج و هەڵپەیەکی بێ سوودە.

بەڵام لای ئیسلام کە مرۆڤ جێنشینی خوا بێ ڕۆژ ڕەش نیەو بـەڵکو بەختـەوەر تـرین دروسـتکراوی خوایـە (ئەگـەر لەسـەر ڕێبازەکـەی خـواوە بـڕوات) و ئـادەمیزاد لای ئیـسلام ئـەبێ پاداشتی هەموو چاکەکانی بکات [٦٧].

٣. ئەو ڕەوشتە جوانانەی کە مرۆڤ لە ئاژەڵ و زیندەوەرەکانی تـر جیائەکاتەوە بە هیچ گۆڕینێك و پێشکەوتنێکی دانیشتوانی سەر زەوی نـاگۆڕین ، بـەڵام وجودیـەکان باوەڕیـان بـە ڕەوشـت نیـە و تێکەڵاوی (سێکس - جنس) بە شتێکی ئاسایی سـەیر ئەکات و لای ئـەوان هـیچ پێویـستی بـە شـاردنەوەی بەرچـاوی خـەڵکی ناکات... وە ئەم تیۆرە هەڵەیە بوو بە هۆی بڵاوبونەوەی (هـیبی) و (بیلتی) و ڕاکردنی لاوەکـانی ئەورووپا و ئەمریکا لە ژیان و لە

---

[٦٦] بۆ وەرگرتنی وئەم خالأنە کەڵکم لە کتێبی ( الوجودیة وواجهات الصهیونیة د.محسن عبدالحمید ) وەرگرتووە .

[٦٧] انه لا ییاس من روح الله الا القوم الکافرون ، یوسف ، ٨٨ .

ژیـانێکی پـڕ لـە ناسـۆرو پـەژارەدا ئـەژین و ئـەو چـەند ڕۆژە ژیانـەیش بەسـەر خۆشـی تلیـاك کێشان و (مۆرفین) خـواردن بـە سەری ئەبەن.

ئیـسلام قەدەغـەی تێکـەڵاوی سێکس (جنس) ناکـات.. بـەڵام سـنورێکی وای بـۆ دائـەنێ کـە جیـاوازی هـەبێ لـە نێـوان ئـادەمیزادی (جێنـشینی خـوادا) لەگـەڵ ئـاژەڵی نـاو گاگەڵـدا... تەنانەت ئیسلام بەشێوەیەك چارەسەری ئەکات مرۆڤ هەر هەستی پێ ناکات کە کێشەیەکی ژیان بێ.

٤. ئەو سەربەستیەی مرۆڤ، کە وجودیەکان باوەڕیان پێی هەیە، بەرژەوەنـدی کۆمـەڵ پێـشێل ئـەکات و ئەبێتـە هـۆی تێکـچوونی کۆمـەڵ و هـیچ کـەس هەسـت بە بەرپرسیاری ناکـات، بـەڵام لای ئیسلام هەموو کاتێك بەرژەوەندی کۆمـەڵ پـێش ئـەخرێت بەسـەر سەربەسـتی (تـاك / فـرد)دا، بەمـەرجێك بـژێوی تاکەکـەیش تێـك نەچـێت. (ئەمـەیش دووڕیـانی جیابونـەوەی یاسـای ئـابووری ئیسلامی یە لە یاسا ئابووریەکانی تر).

٥. لای وجودیـەکان هـەموو مرۆڤێـك خـاوەنی ڕێبـازی ژیـانی تایبەتی خۆیەتی و هیچ کەس نیە هیچ جۆرە یاسایەك بسەپێنێ بەسـەر کەسـی تـردا... بۆنمونـە... جارێـك قوتابییـەك دێتـە لای سارتەر و کێشەیەکی خۆی بۆ باس ئەکات و داوا لەو فەیلەسوفە

ئەکات چارەسەرێکی بۆ بدۆزێتەوە بەڵام سارتەر هیچ چارەسەر و پێشنیارێکی بۆ ئەو قوتابیە ساوایە دا نەناو کێشەکەی دایەوە بەسەر خۆیداو پێی گووت (ئەبێ خۆت چارە بۆ خۆت بدۆزیتەوە) بەڵام ئەم کە فەیلەسوفێکە، ئەیتوانی چەند ئامۆژگاریەك و پێشنیارێك پێشکەش بەو قوتابییەی خۆی بکات....

بەس لای ئیسلام ئەبێ کۆمەڵانی ئادەمیزاد لەسەر ئەو ڕێبازە بڕۆن کە خواکەیان بۆیانی ناردووەو ئەبێ هەموو ئیش و کارێکیان بەڕاوێژ (شوری) [٦٨] و پرسی یەکترین بێت و سوود لە ژیری و زانستی یەکتر وەربگرین... نایەوێ بەناوی سەربەستیەوە (هەریەکەیان ئاوی سەر ملەیەك بخۆنەوە).

---

[٦٨] (وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ) شوری ، ٣٩ .

**دوا ووتەم :**

١. ئەوەندەم داخی بیروباوەڕی پوچ لە دڵدایە، ئەبەم نامیلکەیەو ئەبە چەندان کتێبی تر تەواو نابێ، بەڵام با جارێ ئەوەندە بەس بێت.

٢. من ناڵێم ئەو نوسراوەم دەقی قورئانە و هیچ هەڵەیەکی تێدا نیە... وە ئێمە کە هەڵە لە بیروباوەڕەکانی تر ئەگرین لەبەر ئەوەیە زادەی مێشك و ژیری ئادەمیزادن و ئێمەی ئادەمیزادیش چەندە زانابین قابیلی هەڵەین چونکە تەنیا قورئانە – وەکو خاوەنەکەی – بێ لەکەو دوور لە هەڵەبێ.

٣ـ وەڵامم بۆ ئەوانەی کە لاپەڕەکانی ڕۆژنامەکانیان بە هێرش بردنە سەرم ڕەش ئەکەن، وەکو وەڵامەکەی (مەحوی)یە کە ئەفەرمێ:

لە پاداشتی قسەی سەردا هەمە ئاه و هەناسەی سەرد
کەسێ شەیتانە بەردم تێ ئەگرێ من بەرقی تێ ئەگرم
شوکور هۆشیارە (مەحوی) تێ دەگا دونیا خەراباتە
کە بەد مەستی بکا ئەهلی خراپەی بۆچی لێ ئەگرم

٤. داواکارم لە خوا ئەم نوسینەم لێ وەربگرێت و لاوە سەرلێشێواوەکانیشمان کەڵکی لێ وەربگرن و نزایەکی خێریش بۆ من بکەن.

*  *  *        *  *  *        *  *  *

**سوپاس :**

* سوپاس (جمعية احياء التراث الاسلامي / بغداد) ئەکەم کە یارمەتیاندام.

* سوپاسی مامۆستا عبدالقادر میرخان وە مامۆستا صدیق عبدالعزیز گلاڵی ئەکەم کە هەریەکەیان بەپێی توانای خۆی یارمەتیان دام.

م. شارەزووری

سیدصادق - ١٥/٥ / ١٩٧٧

